




16

نیگاری: محەمەد فەتاح

# ئیسماعیل بێشکچی ..

# ئەو تورکەی هەمیشە بۆ کورد قوربانی دەدات !

بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییەو هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێک
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێک دەری دەکات

دەستەی ڕاوێژکاران
حسین عارف
ڕەووف بێگەرد
ڕێبین ئەحمەد هەردی

سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس

بەڕێوەبەری ڕۆڤار
دلشاد عەبدوڵڵا

سکرتێری ڕۆڤار
عەتا قەرەداخی

سەرپەرشتی هونەری
قادر میرخان

تایپ و مۆنتاجی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سەعید حەمەخان

## وەفایەك بۆ قوربانیدانێکی زۆر .

ئیسماعیل بێشکچی ئەو نووسەرو توێژەرەوەو مرۆڤە زۆر دەگمەنانەیە کە ژیان و نووسینەکانی خۆیان دەخەنە خزمەتی کێشەو خەمی میللەتێکی تر.

ئەو بەرەگەز توورکە بەڵام بەهەموو پێوەرێك دڵسۆزی و ڕاستگۆیی ئەو بەرانبەر کورد لە ئەندازە بەدەرە. تا ئەو ڕادەیەی لەئامادەکردنی ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار)دا بەنیاز بووین لەسەر بەرگەکەی بنووسین (ئەو توورکەی لەکورد دڵسۆزترە بۆ کورد))!

ڕۆڤار وەکو لە ژمارەکانی پێشوودا دەردەکەوێ تایبەتە بەو داهێنەرە کوردانەی لە جومگە جیاوازەکانی مێژووی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و هونەری و کوردییدا جێگەی دیاریان هەیە. بەڵام ئەمجارە لەو ڕەوتە دەردەچین، بۆ ئەوەی بچینە حزووری "تورکێکی کوردەوە"!

وەکو وەفایەکی بچووك بۆ ئەو هەموو قوربانی‌یە زۆرو گەورانەی بێشکچی بەرانبەر بەمیللەتی کورد ئەنجامی داوە. ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار تەرخانە بۆ ئەو، بۆ ئەو مرۆڤەی کەبەڕاستی شایستەیە پێی بووترێ "مرۆڤی ڕاستەقینە"، بەتایبەتی لەو ناوچەیەدا کە ئەتەوە باڵادەستەکان کردوویانەتە دۆزەخ بۆ میللەتە چەوساوەو ژێردەستەکان و لەناو ئەو ژۆلەلێکراوانەشدا میللەتی کورد بەشی شێری چەوساندنەوەو لەناوبردنی بەرکەوتووە

بێشکچی وەکو مرۆڤێکی زاناو چاونەترس و لەخۆ بووردو نەك هەر بەگژ ئەو مێژووە ڕەشەدا چۆتەوە بەڵکو هاتۆتە ناوەوەی لەکێشەو گیروگرفت و لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیانی کوردیشی کۆڵیوەتەوەو چارەسەری گونجاو واقیعی دروستیشی بۆدەستنیشانکردووە، سەرەرای ئەوەش هەموو ژیانی بۆ بەرگری کردن لەو قەناعەت و بیروبۆچوونانە بووە تا ئەمڕۆکە، بەڵگەش ئەوەیە کە زۆربەی زۆری تەمەنی لەزیندانەکانی تورکیاو هاتووچوونی دادگا بەسەربردووە بێ ئەوەی سڵ لەو هەموو حوکمە شۆفێنیانە بکاتەوەو کە بەسەریان دا سەپاندووە. کورد زۆر قەرزاری بێشکچی‌یە، هەرچی بۆ بکرێ کەمە. دۆستی وەکو بێشکچی -یش کەمە، دەزگای سەردەم خۆی بەقەرزاری ئەو زاتە گەورەیە دەزانێ. پێی وایەچاپکردنی کتێبێك و دوو کتێبی یا تەرخانکردنی ڕۆڤارێك ناگاتە ئاستی نووسین و هەڵوێستە جوانەکانی ئەو دۆستە خۆمانەیە، بەڵام چاوی لێیە کە هەل زیاتر هەڵبکەوێ و کتێبەکانی تریشی بەکوردی چاپ بکات و هەروەها لەناو گۆڤارەکانییدا شوێنی زیاتری بۆتەرخان بکرێ.

پێویستە لەکۆتاییدا ئەوەش دووپات بکەینەوە کە ئەو ڕێبازەی بێشکچی هەڵیبژاردووە لەهەناوی ڕاستی‌یەکی حاشا هەڵنەگردا هاتووە ئەویش کێشەی میللەتانی چەوساوە دەبێ چارەسەربکرێ، ئەمڕۆ لەتورکیا لە جیهاندا سەرەتای چوونە پێشەوەی ئەو ڕێبازە دەرکەوتووە بەڵام هێشتا ئەمی عەقڵیەتی عەسکەرتاریی و شوفێنیەت لەناوچەکەدا نەڕەویوەتەوە. گۆڕینی هەندێ بڕگەش لە دەستووری تورکیا و خوێندن و پەخش کردن بەکوردی هەنگاوێکی سەرەتاییەو شتی ترو شتی تری بەدوادا دێ و دڵنیاین ئەوەی "دۆستە ڕاستەقینەکەمان" دەیخوازێت بۆ کورد بەئەنجام دەگات.

ڕۆڤار

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیری‌یە
هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێك دەری دەکات

ناونیشان
سلێمانی -فولکەی بەکگرتن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار
ت / 2120690
لەدەرەوەی کوردستان
Tel: 0044162846008
Fax: 00441628477660

چاپخانەی (ڕەنج)

## محەمەد فەتاح

- ساڵی ١٩٦٥ لە سلێمانی لەدایك بووە
- 1985 پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی لەسلێمانی بەشی شێوەکاری تەواوکردوە.
- ئەندامی گروپی هەشتەو دەستەی دامەزرێنەریەتی
- ٤ ساڵ سەرپەرشتیاری پرۆژەی هونەری خونچەو نەوجەوانان بووە.
- چەندین خولی هونەری وێنەکێشانی وەك مامۆستاو سەرپەرشتیار سازداوە
- خاوەنی چوار پێشانگەی تایبەتی‌یە لە ساڵانی 987- 985- 995 2000
- بەشداری زیاتر لە ٩٠ پێشانگەی هاوبەش کردووە لە ناوەوەو دەرەوەی کوردستان .
- خاوەنی حەوت بڕوانامەو خەڵاتی ڕێزلێنانی هونەرییە.

# کورتەی ژیانی بێشکچی و بەرهەمەکانی



بێشکچی لە ساڵی 1939 لە شاری جۆروم لە هەرێمی ئسکیل لەدایکبووە. خوێندنی سەرەتایی و دواناوەندی لە زێدی خۆی تەواوکردووە، پاشان چۆتە زانکۆی ئەنقەرەو لەوێ لە ساڵی 1962دا بڕوانامەی لیسانسی لە زانستی سیاسیدا بە دەستهێناوە.

ساڵی 1961 کە ساڵی خوێندنی مەیدانی بوو بۆ بێشکچی، ئەو بەپێی دیاریکردنی کۆلیژەکەی و خۆی بۆ ئەو مەبەستە چووە ناوچەی (الازیغ) و دەورووبەری کەوتە ئامادەکردنی توێژینەوەی مەیدانی بێشکچی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کوردەوە پەیداکردو پاش وردبوونەوەو بەدواداچوون هەر زوو تێگەیشت کە ئەم گەلە تورك نین و پێکهاتەیەکی ئیتنیکی سەربەخۆن و ئەوەشی خستە دووتوێی لێکۆڵینەکەیەوە. کاتێ گەڕایەوە زانکۆو گفتوگۆی لێکۆڵینەوەکانی خۆی کرد مامۆستاکانی و بەرپرسان وریایان کردەوە کە ئەو باسانە مەترسیدارن، لە کاتێکدا باسەکانی دەربارەی زمانی کوردی و جوگرافیاو مێژووی کوردستان بوو.

لەوکاتە بەدواوە ئیسماعیل بێشکچی گرنگی تەواوی بە کوردو کێشەی کوردو مەسەلەی نەتەوایەتی کورد داوەو بگرە یەکەمین توێژەرو کۆمەڵناسێکی غەیری کوردە کە بەو بەرفراوانیە ژیانی خۆی بۆ کوردو لێکۆڵینەوە لە لایەنە جۆراوجۆرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری و فەرهەنگی ئەم نەتەوەیە تەرخانکردبێت.

بێشکچی لە دوا ساڵی زانکۆیدا کە ئەم خۆی بە زمان و مێژووی کوردەوە خەریك دەکردو لە بەرامبەر ڕاکانی ئەمیشدا مامۆستاکانی کە سووربوون لەسەر ئەوەی کورد ڕەگەزێکی سەربەخۆ نین و بەڵکو تورکی چیایین. هەمیشە لە بەرامبەری مامۆستاکانیدا دەوەستاو وەڵامی ئەو تێڕوانینە نازانستی و شۆڤێنیانەی دەدانەوە. ئەمەش لە خۆیدا وەکو سەرەتایەکی تێوەگلانی بێشکچی لە تاوانێکەوە سەیردەکرا (لە ڕوانگەی کەمالیستەکانەوە) کە دواتر بێشچکی لەو پێناوەدا باجی زۆریداوە.

دوای تەواوکردنی زانکۆ لە ساڵی 1962دا بێشکچی چووە ڕیزی سوپاوەو هەتا ساڵی 1964 لە ناوچەکانی بەتلیس و هەکاری ژیانی بەسەربرد کە دوو شاری کوردستانن. مانەوەی بێشکچی بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەو ناوچانە هۆکارێکی چاك بوو بۆ ئەوەی زیاتر خۆی بە مەسەلەی کوردەوە خەریك بکات و تێیدا قووڵ ببێتەوە.

دوای ساڵی 1964 و دەرچوونی لە ڕیزی سوپا، بێشکچی بۆ ماوەیەکی کورت لە بەڕێوەبەرایەتی دارایی کاریکرد، پاشان هەر هەمان ساڵ زانکۆی ئەتاتورك لە شاری ئەرزەڕۆم وەکو مامۆستای یارمەتیدەر وەریگرت و لەوێ بووە مامۆستای کۆمەڵناسی. لە ساڵی 1969دا لە بواری زانستی کۆمەڵناسیدا بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرت. هەر ئەو ساڵە لە کوردستان خۆپیشاندان و نارەزایی دەستییێکرد کە بە ڕاپەڕینەکانی ڕۆژهەڵات ناودەبرا. بێشچکی لەو خۆپیشاندانانەدا بەشداریکردو ئەو بەشدارییە تایبەتییەی خۆی ڕێگای بۆ خۆشکرد تا زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەو توێژینەوە لە بواری کۆمەڵناسیدا بنووسێت یەکێك لەو توێژینەوانەی کە دوای ئەو خۆپیشاندان و ڕاپەڕینانە کردی بە ناونیشانی "خۆپیشاندانەکانی ڕۆژهەڵات و شیکردنەوەیان دابوو. کە بە وردی لە بارەی هۆکارەکان و شێوازی خۆپیشاندان و دەرئەنجامەکانیەوە دوابوو. هۆی سەرەکی ئەو خۆپیشاندان و ڕاپەڕینانەی بە نەبوونی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و مافە نەتەوەیی و ئیتنیکییەکان و گرنگی‌نەدانی دەوڵەت بەو ناوچانە دانابوو

بیشکچی له ساڵی 1968دا کتێبێکی لەژێر ناونیشانی "ڕژێم له ئانادۆڵی ڕۆژهەڵاتدا (کوردستان)" بڵاوکردەوه کە دەربارەی بنەمای کۆمەڵایەتی- ئابوری و بنیادی نەتەوایەتی دانیشتوانی ئەو هەرێمە فراوانە بوو. بڵاوکردنەوەی ئەم کتێبە پاش ماوەیەکی کورت کرا بە بەڵگە بۆ دەرکردنی بیشکچی له زانکۆو له ساڵی 1969دا کە تازە بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتبوو، بەرپرسانی زانکۆی ئەتاتورك فەرمانی دەرکردنیان لە زانکۆ بۆ دەرکرد لەبەرئەوەی بە بۆچوونی ئەوان بیشکچی دژی یەکێتی نەتەوەیی تورکیا کاری دەکرد. ئەم کتێبه له هەمان ساڵدا له لایەن دەزگای بڵاوکردنەوەی (E) بە چاپ گەیەندراو جێگایەکی دیاریگرت و سەرنجی خوێنەرانی بە شێوەیەکی بەربڵاو بۆ خۆی ڕاکێشا. ئەمەش جارێکی تر ڕقی سەرۆکی زانکۆی ئەتاتورك و بەرپرسانی تری تورکیای بەرامبەر بە بیشکچی وروژاندو سەرۆکی زانکۆ لە 1970/6/22دا نامەیەکی بۆ بیشکچی نووسی و تیایدا پێی ڕاگەیاند کە ئەو نازناوەی پێشتر زانکۆ وەکو "توێژەری زانستی" پێی بەخشیبوو لێی دەستێنێتەوە دیسان لەسەر ئەم کتێبه بیشکچی دادگایی کرا.

دوای ئەوەی بیشکچی هیچ پەیوەندییەکی بە زانکۆی ئەتاتورکەوه نەماو خۆی بۆ نووسین و توێژینەوه زانستییەکان تەرخانکردبوو، بەشی زانستە سیاسیەکانی زانکۆی ئەنقەرە داوای مامۆستایەکیان کرد بۆ گوتنەوەی بابەتی کۆمەڵناسی. بیشکچی بەشداری تاقیکردنەوەو پێشبڕکێی کرد بۆ ئەو پۆستەو لە تاقیکردنەوەدا بەسەر ئەوانەی تردا سەرکەوت کە بەشداری ئەو تاقیکردنەوەیان کرد، لە ئەنجامدا ساڵی 1971 بیشکچی بوو بە مامۆستا لە زانکۆی ئەنقەرە.

دوای کودەتا سەربازییەکانی ساڵ 1971 کەسانێکی زۆر ڕەوانەی زیندانەکانی تورکیا کران. لە 1971/6/24 دادگای سەربازی دیاربەکر بڕیاری دەستگیرکردنی بیشکچی دەرکرد، ئەویش لەسەر ئەو لێکۆڵینەوەو توێژینەوانەی لە زانکۆی ئەتاتورك کردبوونی و ئەو وتارانەی لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان و کتێبەکانیدا بڵاوی کردبوونەوه. دادگای سەربازی تورکی بیشکچی بەوه تاوانبارکرد کە باسی بوونی نەتەوەی کوردو زمانی کوردی و مێژووی کوردی کردووەو بەم کارەشی ناڕاستەوخۆ هانی کوردەکان دەدات بۆ دژایەتی کردنی دەوڵەتی تورکی و ئەوەش هەوڵێکه بۆ تێکدانی یەکێتی خاك و گەلی تورکیا، لەو دادگایی کردنەدا هەموو مامۆستاو خوێندکاران و کارمەندانی زانکۆی ئەتاتورك لە دژی بیشکچی شایەتیان دا. لەو ساتە کورتەدا بیشکچی بەهاو گرنگی ئەو ئەرکەی زانی کە لە ئەستۆی گرتبوو لەبەرئەوه نکوڵی هیچ خاڵێکی تاوانبارکردنەکەی نەکردو دادگا فەرمانی سیانزە ساڵ و حەوت ڕۆژ زیندانی کردنی دا بەسەریدا، کە بەشێکی ئەو ماوەیەی لە زیندانی بوو، لە زیندانی دیاربەکر بوو، پاشانیش گواسترایەوه بۆ چەند زیندانێکی تر.

له ساڵی 1972 کە جارێکی تر حکومەتی مەدەنی دەسەڵاتی گرتەوه دەست. لێبوردنێکی گشتی دەرکردو بیشکچی بەر ئەو لێبوردنە کەوت و لە زیندان ئازاد کرا، بەڵام دوای ئازادکردنی زانکۆی ئەنقەرە ڕێگای نەدا وەکو مامۆستا بگەڕێتەوه بەو بیانووەی کە بیشکچی دژی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا کاردەکات.

لەو کاتە بەدواوە بیشکچی دەستی دایە نووسین و بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك کتێب و بەشی زۆریانی لە دەزگای بڵاوکردنەوەی KOMAL PRESS لە ئەنقەرە بە چاپ گەیاند. لەو کتێبانەش "پرۆگرامی زانستی و چۆنێتی داڕشتنی لە تورکیا، گواستنەوەی کوردو نیشتەجێکردنەوەیان" لە هەموویان دیارتر بوون، دەوڵەت ئەم کتێبەی دواییانی لە بازاڕدا کۆکردەوەو دەستی بەسەرداگرت و دیسان لەسەر ئەم کتێبه جارێکی تر بیشکچی درایەوه بە دادگای کەتتی تورکی و دادگایی کرا. هەر لەوکاتەدا کە هێشتا بڕیاری کۆتایی دادگای لەسەر دەرنەچووبوو دوو کتێبی تری بڵاوکردەوه. کە یەکێکیان بەشی دووەمی "پرۆگرامی زانستی" بوو، ئەوی تریشیان کتێبی "تێزی تورك بۆمێژوو" بوو. کتێبی دووەمیان کە زیاتر پەیوەندی بە کوردو کێشەی کوردەوه هەبوو تاوانەکەی بیشکچی گەورەتر کرد

بە پێی ماددەی (142) لە یاسای سزادان بیشکچی لەسەر کتێبی یەکەمی هەژدە مانگ سزادراو، لە 1979/4/6دا جارێکی تر لەسەر کتێبی (تێزی تورك بۆ مێژوو) بۆ ماوەی سێ ساڵ ڕەوانەی زیندان کرایەوه کە هەتا 1981/4/12ی لە زیندانەکانی (تۆب کاسه، ستواریا، ڤانیارجه) بەسەربرد پاشان ئازادکرا

بەڵام دوای دوو مانگ لە ڕزگاربوونی جارێکی تر دەستگیر کرایەوه لەسەر نامەیەك کە بۆ یەکێتی نووسەرانی سویسرای ناردبوو، ئەوەش ئاشکرا نەبوو کە ئایا نامەکە گەیشتۆتە شوێنی مەبەست یان نا. بەڵام ئەو نامەیە بوو بە بەڵگەیەك بە دەستی عەسکەرییەکانی تورکیاوه بۆ تۆمەتبارکردنی زیاتری بیشکچی بەوەی کە بەرگری لە نەتەوەی کوردو کوردستان دەکات کە چۆن بە دەستی فەرمانڕەوایانی تورکیاوه دەچەوسێنرێتەوه.

ئەم نامەیە بوو بە هۆی ئەوەی جارێکی تر لە 1983/1/19دا بیشکچی دادگایی بکرێتەوەو لە ئاکامدا (10) دە ساڵ زیندانیان دابەسەریدا. ماوەی شەش ساڵی لە زیندانەکانی ئەزمیرو جەناق و قەلعەو غازی عەنتاب بەسەربرد. لە 1987/7/25دا ئازاد کرا. جارێکی تر لە ساڵی 1989دا لەسەر بڵاوکردنەوەی وتارێك لە "داهاتووی ئازاد"دا درایەوه بە دادگا، بەڵام ئەمجارەیان بەرگری لە خۆی کردو لە ئاکامدا زیندانی نەکرا.

بیشکچی لە ساڵی 1990دا کتێبی "کوردستان کۆلۆنیەکی نێودەوڵەتی" بڵاوکردەوه کە پێشوازییەکی گەرمی لە لایەن کوردو غەیری کوردەوه لێکرا. لەم کتێبەدا بیشکچی دەربارەی چۆنێتی داگیرکردن و دابەشکردنی کوردستان دەدوێت و کوردستانی وەکو کۆلۆنیەك باسکردووه کە چەند دەوڵەتێکی کۆلۆنیالیزم داگیریان کردووەو هەریەکە لەو دەوڵەتانە کوردستانی خۆیان هەیە تەنیا کورد نەبێت کە خاوەنی کوردستانی خۆی نیە. کاتێ دەوڵەت بەوەی زانی کە ئەم کتێبە چۆن لە لایەن خەڵکەوه گرنگی پێدەدرێت بە زووترین کات لە بازاڕدا کۆکرایەوەو پاشانیش جارێکی تر بیشکچی لەسەر ئەم کتێبه برایەوه بەردەمی دادگای ئەستەمبوڵ و پاشان نێردرا بۆ زیندانی (ساغ ماجلار) و زیندانی کرا، کاتێ بیشکچی لە زیندان بوو دەزگای بڵاوکردنەوەی (ئالان) کتێبی "ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی دەوڵەت و دیموکراتی و کێشەی کورد"ی بڵاوکردەوه کە بیشکچی پێشتر نووسیبووی. دیسان ئەمەش بوو بەو بەڵگەیەکی تر بۆ تاوانبارکردنی. هەر بە دوای ئەوەدا دەزگای بڵاوکردنەوەی "میلسا" کتێبێکی تری بیشکچی بڵاوکردەوه بە ناونیشانی "یەك ڕۆشنبیرو یەك ڕێکخراو و کێشەی کورد". لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەم سێ کتێبه دیسان بیشکچی درایەوه بە دادگاو بە پێچەوانەی جارانی پێشووەوه ئەمجارەیان دادگایکردنەکەی بە ئاشکراو بە بەرچاوی خەڵکەوه بوو جەماوەرێکی زۆر ئامادەی بینینی دادگایکردنەکەی بوون. بیشکچی بە بەڵگەی بەهێزو سەلمێنەر بەرگری لە خۆی و بۆچوونەکانی کرد. لە ئاکامدا ئەو بەرگریکردنە بەهێزەو بارودۆخی ئەو کاتەی تورکیاش دادگای تورکیایان ناچار کرد لە 1990/7/25دا واز لە بیشکچی بهێنێت.

جارێکی تر بیشکچی لە تشرینی یەکەمی 1990 دەستگیرکرایەوه بەڵام لەو دەمەدا هەردوو بڕیاری (141 و 142)ی سزادان کە بیشکچی بەپێی ئەوان گیرابوو هەڵوەشێندرانەوەو بەوەش بیشکچی لە زیندان ڕزگاری بوو.

لە ساڵی 1991دا کە یاسای دژی تیرۆر لە تورکیا دەرچوو یاساکانی 140 و 141 و 142ی ساڵی 1930 هەڵوەشێندرانەوە. دەبوو نیتر سانسۆر لەسەر کتێبەکانی بێشکچی نەمێنێت، بەڵام هەر بە دوای ئەوەدا کە کتێبەکانی (پرۆگرامی زانستی و پرۆگرامی گەلی تورکی ساڵی 1930 و کێشەی کورد لە تەموزی ئەوساڵەدا بلاوکرانەوە بە زوویی قەدەغەکران و پۆلیسی تورکی هەڵی کوتایە سەر ئەو دەزگایەی بلاوی کردبوونەوەو دەستی بەسەر هەزار کتێبدا گرت.

لە ڕۆژی 1991/8/1دا بێشکچی دەستبەسەرکراو بەپێی یاسای قەلاچۆکردنی تیرۆر مادەی ژمارە (3713) ڕەوانەی زیندانی ئەنقەرە کرا. ئەم جارە بەوە تاوانبارکرا کە بانگەشەی پارچەپارچە بوونی تورکیای کردووەو دژی یەکێتی خاك و گەلی تورکیا کاردەکات و سوکایەتی بە نیشتمان و نەتەوەی مەزنی تورکیا دەکات کە ئەوەش تاوانێکە لێخۆشبوونی نیە. لە 10/31 هەمان ساڵدا بێشکچی لە زیندان ئازاد کرا. ڕاستەوخۆ بە دوای ئەوەدا دەزگای نیشتمانی بۆ بلاوکردنەوە هەموو کتێبەکانی بە چاپ گەیاند.

هەتا ساڵی 1993 سەرجەم کتێبەکانی کەتاکو ئەو کاتە (29) کتێب بوون هەموو یان چاپکران، حەوت کتێبیان نەبێت کەلە ژێر نەشتەری سانسۆر دەرباز نەبوون.

دوای چاپکردنی کتێبەکانی بێشکچی وتارێکی بەناو نیشانی ((پەیوەندی کردنی ژنی کورد بەهێزی پشتگیریەوە)) لەڕۆژنامەی ((ئۆلکە)) بلاو کردەوەو بەهۆی ئەو وتارەوە ساڵێکی تەواو زیندانی کرا. هەروەها لەسەر کتێبی (( ڕوانین بۆ پارتی کرێکارانی کوردستان و ئەلتەرناتیڤی سەربەستی)) سێ ساڵو نیو زیندانی کرا. هەر هەمان کات لەسەر کتێبەکانی (( پرۆگرامی زانستی تورکی و پرۆگرامی فیرقەی میللی کۆماری و کێشەی کورد)) غەرامەیەکی خەیاڵی لەسەردانرا.

بێشکچی لەژیانی خۆیدا چەندین جارو لەلایەن چەندین دەزگاو ڕێکخراو و کەسێتیەوە خەڵاتی ڕێز لێنانی پێشکەش کراوە بەڵام ڕازی نەبووە وەریان بگرێت، بۆ نموونە ساڵی 1993 ڕازی نەبوو ئەو خەڵاتە وەربگرێت کە ڕێکخراوی ((ڕای ئازادی)) ئەمەریکی پێی بەخشیو بڕی (10) دە هەزار دۆلار بوو، ساڵی 1995خەڵاتی ((بیرکردنەوەی ئازاد))ی ئەرویژی ڕەتکردەوە. هەروەها خەڵاتی یەکێتی نووسەرانی ئەڵمانیایی ڕتکردەوە لەبەرئەوەی ئەڵمانیا پشتگیری دەوڵەتی تورکی دەکات لەدژی کورد، دواجار لەساڵی (2000)دا بێشکچی بەشانازیەوە خەڵاتی مەعنەوی عوسمان سەبری وەرگرت و لەکاتی وەرگرتنی ئەو خەڵاتەشدا گوتی جێگای شانازیمە کە خەڵاتی پیاوێکم پێ ببەخشرێت هەموو ژیانی لەپێناوی ئازادی و سەربەخۆیی گەلی کوردی بێ بەش لەهەموو مافە مرۆییەکان بەخت کردووە.

بێشکچی تاکو ئێستا (41) ساڵ سزای زیندانی کردنی دراوەتە سەرو سێ ملیارو (576) هەزار لیرەش غەرامە کراوە. تاکو ئێستاش بە فیعلی سیانزە ساڵی ژیانی لەناو زیندانە جۆراوجۆرەکانی تورکیادا لەسەر کێشەی کوردی و داواکردنی ئازادی و دیموکراتی بەسەربردووە. بۆ ئەو دەعوایانەشی کە هێشتا بەردەوامن لە سەری دەبێ (75) ساڵ لە زیندان بمێنێتەوەو نزیکەی حەوت ملیار لیرەی تریش غەرامە بدات. بەڵام بێشکچی ئەو خەباتگێڕە ئاسۆ ڕوون و نەبەزیووەیە کە زیندان و سزا ناتوانن لە پەیامی مرۆڤانەی خۆی دووری بخەنەوە.

## بێشکچی ( 29 ) کتێبی بلاوکردۆتەوە کە ئەمانەی خوارەوە بەشێکیانن، ئەمە سەرباری چەندین وتارو چاوپێکەوتن.

1-ڕاپەڕینەکانی ڕۆژهەلات- 1967.

2-خێڵە کۆچەرییەکانی ئەنادۆڵی ڕۆژهەلاتی (کوردستان) 1992

3-گۆڕانکارییەکانی ڕۆژهەلات و کێشەکانی بنیادو پێکهاتەی کۆمەلایەتی خێڵی عەلیکان 1969.

4-سیستەمی ئەنادۆڵی ڕۆژهەلات 1969 (لە دوو بەشدا)

5-پرۆگرامی زانستی تورکیای (1930) چاپی 1967.

6-پرۆگرامی زانستی و چۆنێتی دارشتنی لە تورکیاو گواستنەوەو نیشتەجێکردنەوەی بە زۆری کوردەکان 1977.

7-تێزی مێژووی تورك و كێشەی كورد 1978.

8-پەیڕەوی فیرقەی میللی کۆماری (حیزبی ئەتاتورك) و كێشەی كوردستان 1990.

9-دەستوری تونجەلی ساڵی 1935 و قەلاچۆی بە كۆمەڵ لە دەرسیم 1990.

10-تراژیدیاکانی ژەنراڵ مەغالی و سی و سێ گولله 1991.

11-پەیڕەوی فیرقەی میللی کۆماری ساڵی (1931) و كێشەی كورد 1991.

12-كوردستان كۆلۆنیەكی نێو دەوڵەتی 1990.

13-ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی دەوڵەت- دیموكراتی و كێشەی كورد 1990.

14-یەك ڕۆشنبیرو یەك ڕێكخراو و كێشەی كورد 1990.

15-بەرگری 1991.

16-ڕوانین بۆ پارتی كرێكارانی كوردستان و ئەلتەرناتیڤی سەربەستی 1992.

17-قەلاچۆی سەربازگە سەربازییەكانی دوژمن لە عەقڵی خۆتاندا بكەن 1991.

18-بارودۆخی شۆڕش 1991.

19-نامەیەك بۆ یونسكۆ 1991.

20-ڕاوبۆچوون سەبارەت بە ڕۆشنبیری كورد 1991.

21-تیرۆر لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا 1991.

22-لە بارەی كۆمەڵگای كوردییەوە. ئەم كتێبە ساڵی 1971، نووسراوە بەلام 1993 چاپكراوە.

23-ململانێی ئیمپریالیستەكان لەسەر دابەشكردنی كوردستان لە نێوان ساڵانی (1915-1925)دا.

24-كێشەی بێشكچی لە چوارچێوەی بنەماكانی پەیڕەوی زانستیدا- سەربەستی زانكۆو كۆمەڵگەی دیموكراتی ئەم كتێبە لە چواربەش پێكهاتووە.



# زانیاری لەبارەی

# گەلی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتەوە

وەرگێڕانی: ئەلقید

زاناکان ئەوەیان دۆزیەوە کە دوو لەوحە لە لەوحەکانی سۆمەری کە دۆزراونەتەوە لەبارەی وڵاتێکەوە دەدوێن کە پێی دەوترێت (کارداکا)و ئەو مێژووەش هی دوو هەزار ساڵ پێش زاینە. ئەم ناوچەیەش دەکەوتە ناوچەیەکی هاوسنووری خێڵی (سۆ) کە دەکەوتە باشووری دەریاچەی وانەوە. شەرەفنامە باسی ئەوە دەکات کە قەڵایەك لە ناوچەی بەتلیس هەبووە بەناوی (سۆ). دوای هەزار ساڵ لە پاش ئەم نووسینە کۆنانە (تیگلانی پیسەر) کەوتۆتەوە شەڕەوە لەگەڵ گەلی کورتی‌دا لە چیای ئازۆ. لەوانەیە ئەم ناوچەیە ناوچەی هزرۆرساسۆن بێت. گەزنەفۆنیش لە گەرانەوەی دە هەزار سەربازەکەدا ساڵی (400-401)ی پێش زاین باسی ڕێگاگرتنی کاردۆکیەکان دەکات. وڵاتی کاردۆکیەکان بریتی بووە لە ڕۆژهەڵاتی ڕووباری بۆتان، لەو سەردەمەدا کوردو ئەرمەن‌و عەرەب وەکو یەك ژیاون. کاردۆکیە دێرینەکان ئەگەر پەیوەستبووبن بە سامیەکانەوە یان هەر ڕەگەزێکی تری ناوچەیی، ئەوە ئەو زەوییەی کە ئەوانی لەسەری دەژین نیشتمانی ئێستای کوردەکانە. واش دەردەکەوێت کە کاردۆکیەکان‌و کورد لەیەك سەرچاوەن.

لە بڵاوبوونەوەی جوڵانەوەکانی فەتحی عەرەبییەوە زانیاری بەربڵاو لەسەر کوردەکان دەبینین. لە پێنج ساڵی یەکەمی هیجریدا کوردەکان ڕۆڵی کاریگەریان بینیوە، لەو سەردەمەدا زۆر خێزانی ڕەسەن‌و ڕەگ و ریشەداری کورد دەرکەوتن. لە سەدەمەکانی شەش‌و نەدا و لەو سەردەمەدا کە مەغۆل و تورکەکان هاتنە ئەنادۆڵ، کوردەکان دەبینین بەڵام بۆ ماوەیەك دیار نامێنن، بەڵام جارێکی تر لەسەر گۆڕەپانی ناوچەکە دەرکەوتوونەتەوە کوردەکان لە ململانێی توندی نێوان عوسمانی و سەفەویەکاندا ڕۆڵێکی بزوێنەرانەیان لە پەیوەندی نێوان ئەو دوو ئیمپراتۆریەتەو دەسەڵاتدارانی مەمالیکدا بینی. لەو سەردەمەدا سیستەمی دەرەبەگایەتی لەلای کورد دەرکەوتبوو بەرەو شێوازێکی پەرەسەندووتر دەچوو. شەرەفنامە لە باسی ساڵی (1539)دا بەشێوەیەکی دروست وێنەی ئەو دیاردەیە دەکێشێت سنوورەکانی نێوان تورکیاو ئێران وردە وردە کەوتە بارێکی سەقامگیریەوە، ئێرانیەکان پاشەکشەیان کرد بۆ ئەودیوی زنجیرە چیای زاگرۆس. دوڵەتی عوسمانی لەو کاتەدا لە ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات بەرەو بەهێزبوون‌و ڕەگ داکوتان چوو، بۆ ئەو مەبەستەش سوودی لە میرنشینە کوردییەکانی ئەو کاتە وەرگرت و کردنی بە چاودێری پاراستنی هێمنی دژی لایەنی بەرامبەر. عوسمانیەکان بە هیچ شێوەیەك خۆیان لە کاروباری ناوخۆی خێڵە کوردەکان هەڵنەدەقورتان. جۆرێك لە تێگەیشتنی نا ئاشکرا لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندی ئێرانەوە یارمەتی هاوسەنگ بوونی هێزەکانی‌دەدا. بەڵام دەوڵەتی عوسمانی ناوبەناو دەیویست میرنشینەکانی کورد لەناو ببات سەرباری بوونی بەرگری و بەربەست لە بەردەمیدا، هەروەك لە هەمان کاتدا دوڵەتی عوسمانی بۆ ئەو کارە ڕووبەڕووی دژایەتی کردنی زۆر دەبووەوە، لەبەر ئەوە ناچار دەبوو کە ڕێگای هاوپەیمانیەتی لەگەڵ سیستەمی دەرەبەگایەتی کورددا لەبەر بگرێت وەکو ئەوەی دەبوو هەروەك خۆیشی بەهێز بکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئێران.

وەکو دەردەکەوێت گەلی کورد کۆنترین گەلی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتە، کە بە دەوری دەریاچەی (وان)دا دەژین بەتایبەتی لە ناوچەکانی باشوور بەڵام ناوچەکانی باکوری وان ئەرمەنی لێ دەژی. هەروەك کوردەکان لە سوریا و عێراقیشدا دەژین.

لەلای مێژوونوسانی عەرەب زانیاری ڕاستترمان سەبارەت بە کورد دەست دەکەوێت. مێژوونوسان مەسعودی لە ساڵی 943ی زاینی و ئەستەخری لە ساڵی 951ی زاینی لە دانراوەکانیانیدا باسی کوردیان کردووە. شوێنی ناوەندی کوردستان بەواتایەکی فراوان ناوچەی جزیرەی ئەمڕۆمانە. ئەو ناوچەیە کەوا دەرکەوتووە کە کوردستان بووە دواتر فراوان بووە و زۆر شارو گوندی گرتۆتەوە. مەسعودی هەندێ شت دەگێڕێتەوە پەیوەندی هەیە بەو پێکدادانەی کە لە سەردەمە کۆنەکاندا لەنێوان دەسەڵاتدارانی عەرەب‌و کوردەکاندا ڕوویان داوە. سەرباری ئەوە خەلیفەکانی ئیسلام، چ لە سەردەمی ئەمەویدا بووبێت یان لە سەردەمی عەباسیدا بووبێت لە ناوچە جۆراوجۆرەکان شەڕیان هەڵگیرساندووە لە هەندێ کاتیشدا لە میانەی فراوانخوازی عەرەبەکاندا شەڕیان دژی کوردەکان کردووە. ئەمە سەرباری ئەوەی کە سوودیان لە هاریکاری کوردەکان و ئەوانی تریش وەرگرتووە لە شەڕەکانیاندا دژی ئەرمەن و ئێرانیەکان.

پێش بڵاوبوونەوەی تورکەکان و هاتنیان بۆ ئەنادۆڵ، ڕووبەڕووی زۆر لە چالاکی کوردەکان دەبینەوە. مێژوونووسەکان وەسفی ئەو پاڵەوانێتیەی کوردەکان دەکەن کە لەسەردەمی خەلیفە قائم بامر اللە (991-1031) نواندوویانە. هەر لەو سەردەمەدا مەحموودی غەزنەوی کوردەکانی بە دژی عوسمانیەکان ئامادەکردووە هانیداون.

سەرچاوە:
النظام فی الاناضول الشرقیة
الجزء الاول ص 100-102

# تێڕوانینی تیێزی مێژووی تورکو

# تیۆری زمانی خۆر بۆ کورد

پاش ئەوەی بەرخۆدانەکانی کورد لە نێوان *1920*–*1938*دا خەڵتانی خوێن کران‌و کوردستان بەباشی داگیرکراو، هەموو چاوگەکانی ئۆپۆزسیۆن تێك شکێنران، ئەو سیاسەتی ئاسیمیلاسیۆنەی (وەك تورك لێکردن، بەتورك کردن) لەسەر نەتەوەی کورد بەردەوام بوو خێرایی‌و بەرفراوانیەکی گەورەی بە خۆیەوە دی. هەموو ڕێوشوێنێك بۆ کۆیلەکردنی نەتەوەی کوردو لەناوبردنی خودێتی نەتەوەی کورد دانراو خرایە کار. کوردەکان کە لە ساڵانی *1930*دا بە دوژمن ناودێر کرابوون‌و پێیان دەگوترا "چەتە"، "جەردە"، "ڕاوو ڕوتکەر"و پێیان دەگوترا "پێویست ناکات کوردەکان بە مرۆڤ دابنێین، دەبێ وەکو حەیوان ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەین"، لەوە بەدواوە بە "تورکی ڕەسەن، تورکی پاك" ناودێر دەکران. بۆ نموونە بە خەڵکی شارەکانی چۆرم‌و کاستامۆنوو یوزگات دەگوترا تورك‌و بە خەڵکی دیاربەکرو هەکاری‌و ماردینیش دەگوترا "تورکی ڕەسەن"، "تورکی پاك"، ڕادەگەیەنرا کە نەتەوەیەك نیە بە ناوی کوردو زمانێکیش نیە بە ناوی زمانی کوردی ناسرا بێت. وا ئیدیعا دەکرا. پێمان وایە هێنانەوەی چەند نموونەیەك لەو لێکۆڵینەوانەی لە ساڵانی چل بەدواوە لەسەر ئەم مەسەلەیە کراون، بەسوود دەبێت. هەر هەموو ئەم لێکۆڵینەوانەش تیزی مێژووی تورك‌و تیۆری زمانی خۆریان کردووە بە سەرچاوەی خۆیان. واتە ئەو لێکۆڵینەوانەی لە بەشەکانی پێشوودا باسمان کردن.

1–قەدری پەرك (سەرهەنگی روکن– عقید الرکن)، سەردەمە کۆنەکانی باشووری خۆرهەڵاتی ئانادۆڵ، خانەی کتێبی (ئینقیلاب)، ئەستەموول 1934، ل 245–246. سەرهەنگی روکن قەدری پەرك لەو پێشەکیەدا کە لە بەرواری 1941/11/18 دا بۆ ئەم کتێبەی نووسیوە، ئاوا دەڵێت:

" لە شوباتی *1938*دا، کاتێك بۆ خزمەت کردن لە خۆرهەڵات کەوتمە ڕێ، ویستم لە ماوەی مانەوەمدا لەوێ، دەرفەتی کۆڵینەوە لە مێژووی ئەو بەشەی نیشتمانە ئازیزەکەمان لە دەست نەدەم. گرنگی دانی گەورەکانم‌و هاوڕێکانم بەو بەرهەمە مێژووییانەی کە پێشتر نووسیبومن، هەروەها شەوق‌و ئامەزرۆیی بێ‌پایانی خۆم بۆ ئەم بابەتە، سەرچاوەی هاندانم بوون.

کاتێك کە خەریکی ئامادەکردنی ئەو پێویستیانە بووم کە دەبوونە بناغەی لێکۆڵینەوەکانم، بەرهەمی تورکی‌ی بەنرخم دەسکەوت. بەڵام بەشی زۆریان ناوچەیی‌و سنووردار بوون. لێکۆڵینەوەی مەیدانیان لەسەر نەکرا بوو وکەموکورت بوون. لەو بەرهەمە فەرەنسی‌و ئەڵمانیانەشدا کە لە ئەوروپاوە دەستم کەوتبوون، تووشی کۆمەڵێك ناوی بێگانە بووم کە درابوون بەم ناوچەیەو مایەی سەرسوڕمان بوون. هێشتا بەرهەمە ئەوروپاییەکان ناوی کوردستان‌و ئەرمەنستان–یان لەم ناوچەیە دەنا.

ئەوەی مەزنی ئێمە لە خۆرهەڵاتدا ئەشونمای کردووەو زۆر بووە، سەدان ساڵیش شاڵاوی بەرەو خۆرئاوا بردووە. ئەم ناوچەیە کە کەوتۆتە سەر ڕێی تەوژمی ئەو شاڵاوانە، یەکەمین ئیستگەی ئێمە بووە. کەوابێ دەبوو ئاسەوارو پاشماوەی کۆن‌و بە نرخی ئەوەی خۆمان لێرە بدۆزمەوە. دەست نیشانکردنی دۆزراوەکانیشم، ئەرکێکی نەتەوەیی خۆم بوو.

بەناو بەشێکی گەورەی ناوچەکەدا سووڕامەوە (هەندێك شوێن چەندین جار). گەلێك فاکتم لە شوێنی خۆیاندا خستە ژێر لێکۆڵینەوەوە. پاشان لە ڕووی مێژووییەوە سەلماندنم کە ئەم ناوچەیە موڵکێکی کۆن‌و جیانەکراوەی تورك بووە، دانیشتوانیشی بەشێوەیەك کە دەتوانین بڵێین ساف‌و بێگەردە، لە نەژادی تورکن‌و، قەومێك نەبووە ناوی کورد بووبێت، ئەرمەنیەکانیش تەنها لە ئەنجامی کۆچکردندا هاتوونەتە ئێرەو، لە ماوەیەکدا کە لە ڕووی مێژووییەوە ناتوانین بڵێین درێژ بووە، وون بوون.

گیروگرفتـــەکانی نووســـینەوەی مێـــژوو دەزانم. هیـــوادارم لــــە کەموکوڕیەکانم ببوورن."[1]

2-م. شەریف فورات، مێژووی ڤارتۆو شارەکانی خۆرهەلأت، ئەستەموولْ 1948، چاپخانەی شاکا، ل 217، چاپی دووەم، بلأوکراوەی وەزارەتی پەروەردە MEBY، ئەنقەرە 1961، 176 لاپەڕە.

**م. شەریف فورات لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا ئاوا دەڵێت:**

" سوڵتان سەلیم (یاووس) لە ساڵی 1514دا لە دەشتی چاڵدێراندا سوپای شا ئیسماعیلی تێك شکاند، کە لە شارەکانی خۆرهەلأتمانەوە گەڕاوەتەوە، بەچاو ساغی ئیدریسی بەتلیسی سەرۆکی خێڵە تورکیە شاخاویەکانی خالتی- لۆهۆرتۆی بانگ کردۆتە حوزووری خۆی و، ناوی (بابا کوردی)ی بەخشیوە بە عەشیرەتەکەی (کوورت بابا Kurt baba)[2]، کە سەری گەورەیان بووە. ناوچەی دەرەبەگایەتی تایبەتی بۆ جیاکردوونەتەوەو هانی داون بە ناوی (کورد)ەوە لە بەرامبەر شیعەگەری و شا ئیسماعیلدا سەنگەر بگرن! ئەم خێڵانە کە لە چیا بەرزەکانی خۆرهەلأتدا، لە سایەی ئیمتیازێکی ئاواو لە دۆخێکی سەربەخۆدا هەرچییان ویستووە کردوویانە، بەتەواوی لە هەستی یەکێتی نەتەوەیی و تورکایەتی دوور کەوتوونەتەوەو بەڕاستی وایان زانیوە کوردو بابا کوردین. لە کاتێکدا کەناوی بەشەکانی سەرووی شارەکانی خۆرهەلأتمان لەو نەخشەو مێژووانەدا کە پێش سەردەمی سوڵتان سەلیم یاووس نووسراون، (ئۆرارتۆ) بووە، لە مێژووەکانی پاش یاووسدا ناوی کوردستان دراوە بەم نیشتمانەی تورك و ناوی کوردیش بەو خەڵکەی لەم ناوچەیەدا دەژین، ئەو ناوە خەیاڵیانەی ئەسڵ و بناغەیان نیە. شارەکانی خۆرهەلأتمان کە لە ژێر باری ئەم ناوە ساختانەدا دەناڵێنن،[3] لە سەردەمی هەموو پاشاکانی عوسمانیدا، بەرەو بە بێگانە بوون براون، گەلی تورکی ئەم شارانە، کە لە یەکێتی نەتەوەیی تورك دوورخراوەتەوە، لە چەرمە سەریەکەوە بۆ چەرمە سەریەکی تر براون.

سوڵتان یاووس سەلیم، کە لە سەفەری خۆرهەلأت گەڕاوەتەوە بۆ ئانادۆڵ، گەلێك خێڵی تورکی لە ناوەوەی ئانادۆڵ هەڵکەندووەو ناردوونی بۆ شارەکانی خۆرهەلأتمان، بۆ ئەوەی بابا کوردییەکان لە بەرامبەر شا ئیسماعیل و شیعەگەرێتیدا بەهێزو بالأ دەست بکات. پاش ئەوەی لەم سەردەمە نزیکەدا خێڵە تورکەکان لەم ناوچانەدا نیشتەجێ بوون، لەگەڵ بابا کوردییەکاندا تێکەڵ بوون و یەکیان گرت، زمانی تورکی ڕەسەن و بوونی نەتەوەیی خۆیان کردە قوربانی خێڵ و ئازناوی کوردستان و، ناوی (کرمانج)یان وەرگرت." (چاپیی دووەم، ل9)[4]

ئەم کتێبە پێویستی بە لەسەر وەستانێکی زۆر وورد هەیە. چونکە ئەمە زۆر ماناداره. ئەم مانایە لەو نووسینەوە خۆی ئاشکرا دەکات کە سەر لەشکر جەمال گورسەل، سەرۆکی دەوڵەت و سەرەك وەزیری ئەو سەردەمە، وەکو (پێشکەش کردن- تقدیم) بۆ چاپی دووەمی کتێبەکەی نووسیوە، ئەو کاتەی لە ساڵی 1961دا لەلایەن وەزارەتی پەروەردەوە لە چاپدراوەتەوە. لەو نووسینەدا کە سەر لەشکر جەمال گورسەل وەکو سەرۆکی دەوڵەت و سەرەك وەزیر ئیمزای کردووە، داوا دەکرێت کە نووسینەکانی کتێبی ناوبراو، وەکو تاکە راستی، تاکە حەقیقەت قبوڵ بکرێن و لەم ڕوانگەیەشەوە بەتایبەت داوا دەکرێت کە هەموو کەسێك ئەم کتێبە بخوێنێتەوە.

ئەگەر ئەم کتێبە تەنها وەکو بیروڕاکانی شەریف فورات بلأو بکرابایەوە، لەوانە بوو زۆر گرنگ نەبێت. بەلأم کە سەرەك کۆمارو سەرەك وەزیری دەوڵەتیش هەمان بیرو بۆچوونی هەبێت، بمانەوێ و نەمانەوێ دۆخەکە دەگۆڕێ و نووسینەکان وەکو بیروڕایەکی ڕەسمی دەردەکەون. بلأوکردنەوەی کتێبێکی ئاواش کە ئایدیۆلۆجیای ڕەسمی دەوڵەت لە خۆیدا هەڵدەگرێت، لەلایەن وەزارەتی پەروەردەوە، دیسان پڕمانایە. سەرۆکی دەوڵەت و سەرەك وەزیر جەمال گورسەل ئاوا دەڵێت:

" خوێندنەوەی ئەم بەرهەمە کە ئەمڕۆ وەزارەتی پەروەردە چاپی دووەمی بلأودەکاتەوە، لەلایەن هەموو ڕووناکبیرانی تورکەوە، سوودی گەورەی دەبێت. چونکە ئەو هاوولأتیانەمان کە لە خۆرهەلأتی ئانادۆڵدا دادەنیشن، لەبەر ئەوەی بەزمانێك قسەدەکەن لە تورکی ناچێت وایاندەزانی جیاوازن لە تورك و ئێمەش لەبەر بێئاگاییمان وامان دەزانی، ئەم کتێبە جارێکی تر دەیسەلمێنێ ئەوانە تورکێکن ئاو لێڵ ناکەن. بە بەڵگەی زانستیانەی ئەوتۆ کە نکوڵییان لێ ناکرێت لە هیچ سەردەمێکی مێژوودا کۆچێکی بێگانە ڕووی نەداوە کە دانیشتوانی ئەمڕۆی شارەکانی خۆرهەلأتی وەکو پاشماوەیەك بەجێ هێشتبێت. لەسەر ڕووی زەوی، هیچ ڕەگەزێکی خاوەن شوناسی سەربەخۆ نیە، ناوی (کورد)ی لێ بنرێت. کوردەکان تەنها هاوولأتیمان نین، بەڵکو هاوڕەگەزیشمانن بەلأم بەداخەوە، ئیدارەی خراپ و پشتگوێ خستن کە چەندین سەدە بەردەوام بوون، هەروەها پێویستیەکانی ژیانی داخراوی خۆشیان، ئەم ئەنجامەی لێ کەوتۆتەوە کاتی ئەوە هاتووە هەموو ڕووناکبیرانی تورك، ئەرکی سەرشانی خۆیان لە بەرامبەر ئەم دۆخەدا دیاری بکەن. بە تایبەت تورکەکانی خۆرهەلأت کە لەژێر کاریگەری ئەو جۆرە پڕوپاگەندە بێ بناغەو ناڕاستانەو هاوشێوەکانیاندا چاوبەستەکییان لێکراوەو هەڵخەڵەتێنراون و لە ئەنجامیشدا سەریان لێ تێکچووە، پێویستە ئەم کتێبە بخوێننەوە، بیخەنە دڵیانەوەو بەووردی بیری لێبکەنەوە. چونکە بەرەو ڕووناکییان دەبات. بڕوام وایە بەم شێوەیە ڕێگای ڕاست و دروست دەدۆزنەوە. زیاگۆك ئالپ،ئەو بیریارە مەزنەی تیشکی زانستی خستە سەر تاریکاییەکانی مێژووو، خودێتی میللی خۆمانی نیشانداین و فێری کردین، خەڵکی کوێیە؟ ئایا خەڵکی ئەو دیاربەکرە نیە کە تەحریکچی و پڕوپاگەندەچیەکان بە ناوەندی (کوردایەتی)ی دەزانن؟ ئەم ڕاستیە فاکتێکە، بە تەنها خۆی بەئەندازەی نووسینەکانی ئەم کتێبە دەمانخاتە بیرکردنەوەوەو ڕووناکمان دەکاتەوە " (چاپی دووەم، ل 3-4)[5]

3-فەخرەدین کرزی ئۆغلو، ڕیشەی کورد، بەشی یەکەم، ڕیشەی کوردەکان تیرەکانی ئۆغوزە، بلأوکراوەی یانەی ناساندنی دیاربەکر، ئەنقەرە 1963، ل 32.

4-فەخرەدین کرزی ئۆغلو، ئەو کوردانەی لە هەموو ڕوویەکەوە تورکن، بەشی دووەم، تورك بوونی کوردەکان لە ڕووی مێژووییەوە، خانەی بلأوکردنەوەی چاڵشکان، ئەنقەرە 1961، ل 130.

5-فەخرەدین کرزی ئۆغلو، ئاران (گەنجە- قەرەباغ)، ناوی "بیست و چوارییەکان" لەگەڵ "سی و دووییەکان"دا، هەڵکۆڵینی(حفریات) "نەتەوە"کان و بنەچەی کورد- ئاراس، کۆنگرەی شەشەمی مێژووی تورك، 20-26ی تشرینی یەکەمی 1961، TTK، ئەنقەرە 1967، ل 363-413.

6-فەخرەدین کرزی ئۆغلو، مێژووی قارس، بەرگی 1، چاپخانەی ئشل، ئەستەموولْ 1953، ل 96-102. لەم کتێبەدا ڕادەگەیەنرێ کە کاردۆخەکان کورد بوون.

7-محەمەد ئەرۆز، بنەچەی کوردو بەکورد بوونی تورك، کۆنفرانسەکانی سۆسیۆلۆجیا، کتێبی پێنجەم، 1964-1965، کۆلێجی ئابووری زانکۆی ئەستەموولْ (IUIF)، ل 106-121.

8-سالح سان، مێژووی کرۆنۆلۆجیانەو ڕوونکردنەوەی موش و خۆرهەلأتی ئانادۆڵ، بلأوکراوەی کۆلێجی (Yukselis: بەرزبوونەوە)ی تایبەت، ئەنقەرە 1966، ل 256.

9-عومەر کەمال ئاغار، جوگرافیای تونجەلی- دەرسیم، چاپخانەی تورکیا، ئەستەمووڵ 1940، ل 64. (لەم کتێبەدا لە لایەکەوە هەوڵدەدرێ تورک بوونی کورد بسەلمێنرێ، لەلایەکی تریشەوە جوێنی زۆر ناشرین بە کورد دەدرێت.)

10-ئەدیب یاووس (والی خانەنشین)، قەومە تورکەکان بە درێژایی مێژوو، چاپخانەی کورتولوش، ئەنقەرە 1968، ل 427-428. (لەم کتێبەدا هەوڵدەدرێ بسەلمێنرێ کە یۆنان و لاتین و میسر، واتە هەموو گەلانی دەریای سپی لە ڕەگەزی تورکەوە هاتوون. هەر چەندە ناوی کتێبەکە بریتیە لە قەومە تورکەکان بە درێژایی مێژوو، بەڵام بەردەوام باسی کورد دەکات.)

11-محەمەد ئەرۆز، لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆ- کولتووری سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ئانادۆڵ، چاپخانەی بایلان، ئەنقەرە (مێژووی لە سەر نیە)؛ ل 67. (لەم کتێبەدا دەگوترێ نەتەوەیەک نیە ناوی کوردو زمانێکیش نیە ناوی زمانی کوردی بێت. هەوڵی سەلماندنی ئەم قسەیەش دەدرێت.)

12-محەمەد ئەرۆز، تورکایەتیی خۆرهەڵاتی ئانادۆڵ، بڵاوکراوەی کولتووری تورکی، ئەستەمووڵ 1975، ل 175.

13-محەمەد ئەرۆز، لێکۆڵینەوەیەکی سۆسیۆلۆجی لەسەر ناوی گوندەکانی خۆرهەڵاتی ئانادۆڵ. گۆڤاری مێژووی تورک بە بەڵگەوە- BTTD، ژمارە 56، مایسی 1972، ل 30-32

بەشی دووەم- BTTD، حوزەیرانی 1972، 36-38؛

بەشی سێیەم- BTTD، تەمووزی 1972، ل 32-33؛

بەشی چوارەم- BTTD، ئابی 1972، ل 37-39؛

بەشی پێنجەم- BTTD، ئەیلولی 1972، ل 35-37.

(لەم زنجیرە وتارەدا هەوڵدەدرێ بسەلمێنرێ کە میللەتێک نیە ناوی کوردو زمانێک نیە ناوی زمانی کوردی بێت. د. محەمەد ئەرۆز لە هەموو نووسینەکانیدا داکۆکی لەم ئیدیعایە دەکات )

14-مەحمود ڕیشوان ئۆغلو، خێڵەکانی خۆرهەڵات و ئیمپریالیزم، بڵاوکردنەوەی کولتووری تورکی، ئەستەمووڵ 1975، ل 323.

15-سالح فەتحی گۆکچایلی، خێڵ و هۆزە بە نەژاد تورکەکان، BTTD، ژمارە 55، نیسانی 1972، ل 32-35 (ئامانجی ئەم نووسینە ئەوەیە بیسەلمێنێت کە میللەتێک نیە ناوی کوردو زمانێک نیە ناوی کوردی بێت.)

16-ئارن ئەنگین، لە خەباتی ئاتاتورک چێتیماندا کولتووری ئەورووپا چییە؟ چی نییە؟، بڵاوکراوەکانی کولتووری ئاتاتورکچێتی، ژمارە 16، چاپخانەی (Siralar)ی شاری ئاتاتورک (ئەستەمووڵ)، 1960، ل 280.

(لەم کتێبەدا وەک چۆن داکۆکی لەوە دەکرێت کە سەرچاوەی کولتووری شارستانێتییەکانی چین، هند، میسۆپۆتامیا، میسر، ئیجە، لاتین، و ئانادۆڵ بە ڕیشە تورکی بووە؛ ئاواش داکۆکی لەوە دەکرێت کە نەتەوەیەک نیە ناوی کوردی بێت لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر پێشنیار لە کتێبەکەدا هەیە، سەبارەت بە چۆنیەتی لەناوبردنی زمانی کوردو کۆیلە کردنی کوردو لەناوبردنی خودێتی کوردی.) نووسەر ئاوا دەڵێت:

"چۆن دەتوانین یەکپارچەیی تورک دەستەبەر بکەین؟

میتۆدی بۆتەی تواندنەوە، لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا:

لە وڵاتە دیموکراسیەکاندا، بۆ پێکەوە لکاندنی کەمایەتیەکان و مسۆگەرکردنی یەکێتی نەتەوەیی، لە ڕێگەی یاسا توندو تیژەکانی خوێندنەوە کە پێیان دەگوترێ بۆتەی تواندنەوە، لە قوتابخانە سەرەتایی و ناوەندیەکاندا دەرسی دیسپلینی نەتەوەیی دادەدەن. لە ئەورووپاو ئەمەریکادا توندو تیژیی ئەم قوتابخانانە لەم بارەیەوە و پرنسیپی فێرکردن و گونجاندنی منداڵە بێگانەکان، تاڕادەی سەرسوڕمان بە دیسپلین و سەرنج ڕاکێشە. بەتایبەتی ئەو میتۆدەی کە لە لێکۆڵینەوەکانی ساڵانی 1947-1949ماندا لە ئینگلتەرە بینیمان و پێی دەگوترێ میتۆدی (براونی Browny)، ڕێسایەکی بێ وێنەیە بۆ ئێمە کە مایەی بیر لێکردنەوەیە و دەتوانین وەکو خۆی وەری بگرین و پاش ئەوەی بەپێی دۆخی خۆمان گۆڕانی بەسەردا دێنین، پیادەی بکەین.

(میتۆدی براونی) کەلە هەموو قوتابخانە سەرەتاییەکانی ئینگلتەرەدا وەکو پایەی سەرەکیی فێرکردنی نەتەوایەتی و دیموکراسی سیاسی پیادە دەکرێت، بەو شێوەیەی لەکاتی لێکۆڵینەوەکانماندا لە ئەورووپا *1947-1949* بینیومانە، باس دەکەین:

لە قوتابخانەیەکی ئینگلیزیدا لە کۆڵانی (پەمبرتۆن گاردنز)ی لەندەن. ئەو ڕۆژە لیژنەیەکی سێ کەسی تایبەت کە لە بەڕێوەبەرایەتی فێرکردنەوە هاتوون، (مەراسیمی براونی) بە قوتابیان دەگێڕن. ئەمە بەحەوت ڕۆژ جارێک دەکرێت. منداڵان لە ژوورە گەورەکەدا کۆکراونەتەوە. لەوبەرەوە ئاڵای ئینگلیز بە وێنەی پاشا ڕازێنراوەتەوە و هەڵواسراوە. کاتێک کە منداڵان بەیەک دەنگ سرروودی نەتەوەیی دەڵێن. ئاڵای ئینگلیز لە دوولاوە دەکرێتەوە. پاشان ئەو ڕۆژە منداڵان یەک بەیەک و بە ڕیز لەبەردەمی وێنەی (براونی)یەوە بەرەو وێنەی پاشا دەڕۆن و لەبەردەمیدا لە ناخی دەروونەوە سوێندێک دەخۆن کە بە باشی لەبەریان کردووە. بچووکترین دەنگ نابیسترێ، بچووکترین سستی نابینرێ، تیشکی مات و سوورباوی ژوورەکە خراوەتە سەر وێنەی پاشا. وشەکانی ئەو سوێند خواردنە لە دەروونی منداڵاندا کاری خۆی دەکاو فرمێسک لە چاوی هەندێکیان دێنێ.

(من ئینگلیزم، ئینگلیزێتی لە سەروو هەموو شتێکەوەیە، لە سەروو گیان و ماڵ و کەس و کارمەوەی دادەنێم، کەرامەتی ئینگلیز لە مێشکمدا بە زیندوویی ڕادەگرم. لە پێناوی پاراستن و بەرزبوونەوەیدا هەردەم ئامادەی مردنم من ئینگلیز نەبم هیچ نیم )

پاش ئەم مەراسیمە کە بە وردی و هاوئاهەنگ لەگەڵ ئەو ئامانجەدا ڕێکخراون، بە کۆمەڵ ئەنجامدەدرێن. ئەو سوێند خواردنەی کەمێک لەمەوبەر، تاقی دەکرێتەوە کە ئایا لەکاتی خۆیدا بەجێ دەگەیەنرێت یانە. دیسان بە کۆمەڵ سرروودی نەتەوەیی دەگوترێت یەکێکیش لە ئەندامانی لیژنەکە نەسیحەتی توند- جوان پێشکەشی منداڵان دەکات، یەک دوو سەرگورشتەی نەتەوەیی تەزێنەر دەگێڕێتەوە. دواجار شیر و شەکرلەمە بەسەر منداڵاندا دابەش دەکرێت.

لە دیدارو گفتوگۆکانمدا لەگەڵ ئەندامانی لیژنەکە، گوتیان ئەم یاریانە بە چەند مانگ جار دەگۆڕدرێن و تازە دەکرێنەوە، بۆ ئەوەی سەرنجی منداڵان ڕاکێشن،کۆمەڵێک لیژنەو دەزگای تایبەتیش بەتەنها خەریکی ئەم کارەن و بەهەموو قوتابخانەکاندا دەگەڕێن. باسی ئەوەیان کرد کە ئەم میتۆدە، تاکە میتۆدە بۆ ڕەگ داکوتینی نەتەوایەتی ئینگلیزی لە دڵ و دەروونداو یەکێتی و یەکپارچەیی مسۆگەر دەکات، هەموو منداڵە بێگانەکانیش بە هۆی میتۆدەوە بوون بە ئینگلیز. تاکە ڕێگە چارەی ئێمەش لە بەرامبەر ڕەگەز پەرستی کەمایەتیدا ئەمەیە." (ل279)[8]

17-ئارن ئەنگین، زانستی ڕابوردووی کولتووری تورکی لە خەباتی ئاتا تورکچێتیماندا، مێژووی حیتی، بڵاوکراوەکانی کولتووری ئاتاتورکچێتی، ژمارە 17، چاپخانەی (Siralar)ی شاری ئاتا تورک (ئەستەمووڵ)، 1961، ل 224.

18-ئارن ئەنگین، زانستی ڕابوردووی کولتووری تورکی لە خەباتی ئاتا تورکچێتیماندا، تورکەکانی سۆمەر، بڵاوکراوەکانی کولتووری ئاتا تورکچێتی، ژمارە 24، شاری ئاتا تورک (ئەستەمووڵ)، چاپخانەی (Gun)، 1969.

19-ئارن ئەنگین، پرۆمیسۆس لە خەباتی ئاتا تورکچێتیدا، خۆرەکانی کولتووری تورکی ئەورووپا چۆن هەڵهاتن؟ چۆن درەوشانەوە؟ بڵاوکراوەکانی

کولتووری ئاتا تورکچێتی، ژماره 25، شاری ئاتا تورک (ئەستەموول) ، چاپخانەی (Gun)، 1969، ل 256.

لە سەرەتای ئەم کتێبەدا لەژێر ناونیشانی ئایدیۆلۆجیای خۆرە مەزنە تورکەکەمان ئاتاتورک-دا، ئاوا هاتووە: "ئاتاتورکچی‌یەکان یەک بگرن، لەزنجیرەی عوسمانی- سۆسیالیست زیاتر هیچتان نیە لەدەستی بدەن"

20-ئارن ئەنگین، نۆرانوس: دەست پێک: ویژدانی نەتەوەیی، 1-تورکە ئەتروسکەکان خولقێنەرانی شارستانێتی رۆمای مەزن، 2-مێژووی فکرو کولتووری ئەوروپا، بڵاوکراوەکانی کولتووری ئاتاتورکچێتی، ژمارە 28، چاپخانەی (Gun)، ئەستەموول 1971، ل 272.

لەم کتێبەدا پاش ئەوەی لەشوێنی جۆراوجۆردا بانگەشەی تورک بوونی کوردەکان دەکرێو هەوڵی سەلماندنی دەدرێ، رێگەکانی لەناوبردنی نەتەوەی کوردو بەکۆیلە کردنی کوردیش نیشان دەدرێت. (ل دوو- چوار، شانزە-حەڤدە، 9-15، 286)

لەم کتێبەدا ئەو پیرۆزباییانەش بڵاوکراونەتەوە کە بۆ نووسەر نێردراون بۆ ئەو کارانەی لە پێناوی تورکایەتیدا کردوونی. لەناو ئەوانەدا کە پیرۆزباییان لێکردووەو سوپاسیان بۆ ناردووە، ئەم ناوانەی تێدایە: وەزیری دەوڵەت[7] و یاریدەدەری سەرەک وەزیر سەعدی کۆچاش، نووسەر یەعقوب قەدری قەرە عوسمان ئۆغلو. سەرۆکی گشتی پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی (MHP) ئالپ ئەسلان تورکەش، نووسەر جیهاد بابان، فەرماندەی هێزی دەریایی سەر ئامیرال ئەیجی ئۆغلو، سکرتارییەتی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، ئەندامی دادگای دەستووری رەجائی سەچکین، سکرتێری گشتی دەزگای زمانی تورکی عومەر عاسم ئاکسۆی، سەرۆکی ئەنیستیتوی پزیشکیی سەر بە کۆلیجی پزیشکی زانکۆی ئەنقەرە پرۆفیسۆر د. فەرەیدون ئافیزئوزلوک، سکرتێری گشتی وەزارەتی دەرەوە زەکی کونەرالپ.

21-ئارن ئەنگین، بەیاننامەی ئاتاتورکچێتی لە پەنجاهەمین ساڵرۆژی کۆمارەکەماندا، بڵاوکراوەکانی کولتووری ئاتاتورکچێتی، ژمارە 29، شاری ئاتاتورک (ئەستەموول) 1972، ل 128.

ئەم کتێبە لەسەر داوای وەزارەتی پەروەردەو وەزارەتی ڕۆشنبیری ئامادە کراوە. لە کتێبەکەدا پاش سەلماندنی(!) ئەوەی کە کوردەکان تورکن (ل 26-31)، چەند پێشنیارێک پێشکەش دەکرێت سەبارەت بەوەی کە "ڕێگەی لە ناوبردنی کورد، بریتیە لە ڕاگواستنی و نیشتەجێکردنی تورک لە خۆرهەڵات"(ل9). لەم کتێبەشدا وەکو ئەوانی پێشوو، کۆمەڵێک نامەی سوپاس و پیرۆزبایی لەلایەن کەسێتی و دەزگا ڕەسمیە جۆر بەجۆرەکانەوە، بڵاو کراونەتەوە. هەندێک لە خاوەنەکانی ئەو نامانە، ئەمانەن: سکرتێری گشتی سەرۆکایەتی کۆمار جیهاد ئالپان، نووسەر یەعقوب قەدری قەرە عوسمان ئۆغلو، یاریدەدەری سەرەک وەزیرو وەزیری دەوڵەت سەعدی کۆچاش، وەزیری ڕۆشنبیری تەلعەت هالمان، سەرۆکی گشتی (MHP) ئالپ ئەسلان تورکەش، سەرەک وەزیری پێشوو سوعاد خەیری ئوورگوپلو، سیناتۆر ئەحمەد یلدز، فەرماندەی هێزی زەمینی فاروق گوورلەر، فەرماندەی هێزی دەریایی ئامیرال جەلال ئەیجی ئۆغلو، فەرماندەی هێزی ئاسمانی سەرلەشکر موحسین باتور، فەرماندەی (اسطول) ئەمیرال کەمال کایاجان، سەرۆکی ئەرکانی هێزی ئاسمانی سەرتیپی یەکەم ئەحمەد دوران، فەرماندەی سوپای یەکەم سەرلەشکر فایەق توورون، فەرماندەیی سێیەمی هێزی ئاسمانی، نووسەر جیهاد بابان، ئەندامی دادگای دەستووری رەجائی سەچکین، بە ناوی لیژنەی بەڕێوەبردنی وەقفی خوێندنی تورکی‌یەوە سەرۆک وەهبی کۆچ و جێگری سەرۆک د.نەژاد ئەجزاجی باشی، سەرۆکی لیژنەی بەڕێوەبردنی وەقفی خوێندنی تورکی وەهبی کۆچ، یاریدەدەری سەرۆکی وەقفی خوێندنی تورکی د. نەژاد ئەجزاجی باشی، سکرتێری گشتی دەزگای زمانی تورکی عومەر عاسم ئاکسۆی، پرۆفیسۆر د. فەرەیدون ئافیز ئوزلوک سەرۆکی ئەنستیتیوی مێژووی پزیشکیی سەر بە کۆلیجی پزیشکی زانکۆی ئەنقەرە، د.مەلاحەت ئۆزگو بەڕێوەبەری ئەنستیتیو وکورسیی شانۆ لە کۆلێجی زمان و مێژوو وجوگرافیا.

د.ئارن ئەنگین لە هەموو کتێبەکانیشیدا، بە ووردی ووریای ئەوە بووە کە جەخت لەسەر ئەوە بکات کە بە فەرموودەی ئاتاتورک کراوە بە ئەندامی دەزگای مێژووی تورک (1933)و دیسان بە فەرموودەی ئاتاتورک کراوە بە ئەندامی لیژنەی دەرس گوتنەوەو فێرکردنی وەزارەتی پەروەردە (1933-1935)

یەکێک لەو دەقانەی کە زۆرترین جار بەکاری هێناوە، ووتارەکەی ئاتاتورکە بەبۆنەی دەیەمین ساڵرۆژی کۆمارەوە کە بە ڕستەی "چەند بەختەوەرە ئەوەی دەڵێت تورکم" کۆتایی دێت.

### پەراوێزەکان؛

(1 )دەردەکەوێ کە نووسەر بۆ بنیات نان و نووسینەوەی ئایدیۆلۆجیای رەسمیی لەسەر درۆ ڕاوەستاو نێردراوە بۆ "خۆرهەڵات". ئاشکرا دەبێت کە ئەم کارە یەکێکە لەئەرکە سەرەکیەکانی سەربازو ئەفسەرە تورکەکان.

(2)ووشەی (Kurt) لە تورکیدا مانای (گورگ) دەگەیەنێ.

(3)لێرەدا بە باشی دەبینرێت کە ئایدیۆلۆجیای رەسمی لەسەر درۆ دامەزراو، پشت بە زانیاری چەند پێکەنیناوی و بێ مانا دەبەستێت. گوایە "گەلی کورد لە ژێر ناوی کوردستاندا دەناڵێنی". بەڵام کتێبێکی ئەوەندە پڕ لە زانیاری بێ ماناو پێکەنیناوی و پڕ لە دژایەتی، سەرەک کۆمار پێشەکی بۆ دەنووسێ و پرۆفیسۆرە تورکەکانیش وەکو "زانستی‌ترین کتێب"، "جدیترین کتێب" و "نیشتمان پەروەرترین کتێب" بە خوێندکارەکانی خۆیانی دەناسێنن جگە لەوەش، بۆ ڕاپۆرت نووسەکانی بابی عالی لە "خۆرهەڵات"، سەرچاوەیەکە ناتوانن دەستی لێ هەڵگرن.

(4)لێرەدا جارێکی تر زانیاری ئایدیۆلۆجیای رەسمیی پشت بەستوو بە دژایەتیە سازش هەڵنەگرەکان، ئاشکرا دەبێت. بە ئیدیعای نووسەر، دوا بەدوای شەڕی چاڵدێرانی 1514، کۆمەڵێک خێڵی تورک لە ناوەڕاستی ئاناتۆڵەوە نێردراون بۆ "خۆرهەڵات". دیسان بە ئیدیعای نووسەر ئەو کاتەش هێشتا چەمکێک بە ناوی کورد یاخود کوردستان لە ئارادا نیە. چونکە ئەم "ناز ناوانە" لە لایەن سوڵتان سەلیم (یاووس)ەوە بەخشراوە واتە ئەو کاتە هێشتا خەڵک "تورک"ن. بەڵام ئەم خێڵە تورکانە کە لە ناوەڕاستی ئاناتۆڵەوە نێردراون، لە ناو ئەو جۆرە "تورکانە"ی ئەوێدا، بوون بە کورد نازناوی کوردو کوردستانیان قبوڵ کردووە.

(5)سەر لەشکر جەمال گورسەل-ی سەرۆکی دەوڵەت و سەرەک وەزیر کە ئیدیعا دەکات کوردەکان تورکن، لە ڕاستیدا بەم وتارەی خوارەوەی ئاشکرای دەکات کە هەستێکی دوژمنانەی چەند قووڵی بەرامبەر نەتەوەی کورد هەیە:

" ئەگەر تورکە چیاییەکان (کوردەکان) بە زووترین کات نەیەنەوە سەر ڕێ و بە ئاسوودەیی دانەنیشن، سوپا هیچ سڵ لەوە ناکاتەوە کە شارو گوندەکانیان بۆردومان بکاو لەناویان بەرێت. گۆمی خوێنێکی ئەوتۆ دەبێت کە خۆشیان و ناوچەکانیشیان لە ناو دەچن." (وتەیەک رۆژنامەی Dagens Nyheter ی ستۆکهۆلم، 16ی تشرینی دووەمی 1960.)

(6)ئەم نووسینە بە ڕوونی بۆمان دەگێڕێتەوە کە ئەو سوێندەی دەوڵەتی تورک هەوڵ دەدات هەموو بەیانیەک بە منداڵانی کوردی بڵێتەوە. واتە سوێندی "تورکم، ڕاستم، چالاکم، یاسای من ڕێز گرتنە لە گەورەکانم و پاراستنی بچووکەکانمە. هیواو ئایدیالم بەرزی و بەرەو پێش چوونە. بوونم بەفیدای بوونی تورک بێت"، لە کێوە وەرگیراوە. ئەگەر سەرنج بدرێ نووسەر، بە کۆیلە کردنی نەتەوەکانی ترو دانانی هەموو ڕێوشوێنێک بۆ سەپاندنی کولتووری خۆی بەسەریاندا، بە سروشتی دەزانێت. بەڵام ئەوانەی لە بەرامبەر بە کۆیلە بووندا بەرگری دەکەن، دژی سیاسەتە ڕەگەز پەرستەکان ڕادەوەستن، دەیانەوێ خودێتی خۆیان بپارێزن، بە "ڕەگەز پەرستی‌ی کەمایەتی" وەسف دەکات.

(7)لە دەقە تورکیەکەدا نووسراوە (Devlet Baskani) واتە سەرۆکی دەوڵەت و یاریدەدەری سەرەک وەزیر. بەڵام دەبێ (Devlet Bakani) بێت. چونکە سەرۆکی دەوڵەت سەرەک کۆمارەو لە سەرەک وەزیر گەورەترە.

سەرچاوە؛ تێزی تورک بۆ مێژوو
وەرگێڕانی: ئاسۆس هەردی

# بێشکچی

# لەسەر بەڵگەنامە نهێنییەکانی ئینگلیز سەبارەت بە کوردستان دەدوێ

یەکێك لە کاردانەوە گرنگەکانی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا بۆ ئەنادۆل، چی لەسەروەختی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بووبێت، یان لەسەروەختی جەنگی رزگاری نەتەوەیدا وەهمی دروستکردنی کوردستان و ئەرمەنستان بووە. ئینگلیز و فەرەنسیەکان و ئەڵمان لە روانگەی بەرژەوەندی خۆیانەوە سەیری ئەم مەسەلەیان کردووە. بێ چەندو چوون ئەم مەسەلەیە لە بەدواداچوونی ئەوەی کە ئیمپریالیزم بیری لێکردۆتەوە لە کتێبی "تورکیا لەبەڵگەنامە نهێنییەکانی ئینگلیز"دا لە ئامادەکردنی ئەرۆڵ ئۆلۆ بلێ دەردەکەوێت.

"کێشەی من کوردەکانن، نۆئێل لە بەغداوە هاتووە بۆ ئێرە، نوئێل پیاوێکی زۆر باشەو یەکێکە لە بەتواناکان، بەڵام لەلایەکی ترەوە دەیەوێت ببێتە پێغەمبەری کوردەکان. ئەو دەڵێت: کەس لە کورد باشتر نییە، کوردەکان زۆر رەسەنن، تا بڵێی پەسەندن. بەڵام ئەرمەن بەپێی ئەوەی کە دەربەکەون بەهایەکی ئەوتۆیان نییە، فێڵبازو تەڵەکەبازن، کوردەکان هیچ ئەرمەنیەکیان نەکوشتووە بە پێچەوانەوە کوردەکان ئەرمەنیەکانیان لە دوژمنان پاراستووە، ئەوەیشی لە واقیعدا روویداوە ئەوەیە کە ئەرمەنەکان ئەوانەن کە کوردیان کووشتوە . لەبەرئەوە ئەوەی لێی دەترسم ئەوەیە کە نوئێل ببێت بە لۆرەنسی کورد. بەپێی ئەوەی کە ئەشێ ببێ بە بەشی ئێمە لە وڵاتی دوو رووبارەکە، هیچ لەوە باشتر نیە کە دەوڵەتێکی کوردی تیادا دابمەزرێنین، بەوەش چیاکانی باکور دەپارێزین، لەگەڵ عەبدولقادر سەبارەت بە راپەڕینەکەی قسەم کرد. داوام لێکرد کە من بچم بۆ کوردستان بۆئەوەی کەڵك لە بەکارهێنانی نفوزی ئەوان و کاریگەری ئەوان لە ناوچەکە وەربگرم. تا ئەو رادەیەی کە ناچار بووم ئەم قسەیە پێنج جار دووبارە بکەمەوەو هەروەها فێڵیشم لە تورکەکان کرد، سەرباری ئەوەش کە ناشێت بڕوایەکی زیاتریش بە کوردەکان بکەیت، لەگەڵ ئەوەشدا ئامانجی حکومەتی خاوەن شکۆ لاوازکردنی تورکەکانە بۆ نزمترین ئاست، لەبەرئەوە جوڵاندنی کوردەکان بەم ئاراستەیە کارێکی خراپ نییە 1919[1] "کاریکاتێرێکتان بۆ دەنێرم کە لە "وێناکردنی فیکرەکاندا" بڵاوکراوەتەوە، ئەو کاریکاتێرە دەروونی نەتەوایەتی و نموونەی باڵای بەشێوەیەك پێچەوانە دەکاتەوە کە بە توندی مرۆڤ تووشی راچڵەکاندن دەکات. لەم کاریکاتێرەدا وێنەیەکی سەرکەوتووی تورکی بە ئاسوودەیی و بە سەربەستی بەسەر ئەنادۆڵی ناوەندا پاڵی لێداوەتەوە، قاچێکی لە تراڵیەو دەستی راستی درێژ دەکات، ئەو قونیەو ئەتینەو ئەزمیری لە دوژمن خاوێن کردۆتەوەو دەستی چەپی بەرەو ئەرمینیاو کوردستان راکێشاوە (وان)ی لەنێوانی پەنجەکاندا ئابلۆقە داوە، سێبەرەکەشی دەکەوێتە سەر دیاربەکرو

سوریا. ئەم نەخشەیەش لە سنووری ئێران و دەریای رەش و هەرێمی ئەتنەوە درێژ دەبێتەوە بۆ نێو وڵاتی دوو رووبارەکە[2].

ئینگلیزەکان دڵنیابوون لە بوونی بڕێکی زۆر لە کانزا لەو هەرێمەی کە دەیانویست دوڵەتێکی کوردی تیا دروست بکەن[3]. سەرۆك خێڵەکانی کوردیش لەو بارەیەوە بەڵێنی رازی بوون بە فەرمانڕەوایی ئینگلیزو فەرەنسیەکان دەدەن و رێگا بە هیچ کەسێکی تورك نادەن لە کوردستاندا بمێنێتەوە، هەروەك داوای بیرکردنەوە لەوە دەکەن کە ئایا ئەم دەوڵەتە کوردییەی کە ئیدیعای دامەزراندنی دەکەن تاکە دەوڵەتێك بێت یان چەند دەوڵەتۆچکەیەکی کوردی. هەروەك دابین کردنی چەك بۆ ئەرمەنیەکان لە کەناڵەکانی ئەمەریکاوە دێتە کایەوە.

راپۆرتەکە سەبارەت بە دروستکردنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی. ناوچەکانی ئەرزەهان و باتوم و چۆمی ئیمەر دەدات بە ئەرمەنەکان، لەگەڵ ئەوەی کە دەکەوێتە رۆژئاوای چۆمی (یان باتی) بە ماوەی تاکە کیلۆمەترێك لە دەریای رەشەوە، لەگەڵ ئەو بەشە درێژبوومیدا هەتا چیای زوڵفك لە ئەرزرۆم و لە رۆژئاوای باشوری چیای خەتابەوە، هەروەها سنووری رۆژئاوای ویلایەتی ئەرزەرۆم و ناوەرۆی قەرەسو، ئاوی سوڵتانی گەورەو چۆمی ئاق تاش و مۆسیلاو موراد سوو گوڵدەرەی بەتلیس[4].

دەکرێت کوردستان لە توکیا جیابکرێتەوەو هەموو کوردستان یەکبخرێت هەروەك دەتوانین هاوجۆریی لە نێوان بەرژەوەندییەکانی ئەرمەن و کورددا بکەین. سەرۆکی یانەی کوردی لە ئەستەنبوڵ سەید عەبدولقادرو سەرۆکی وەفدی کوردی بۆ کۆنگرەی پاریس شەریف پاشا لە ژێر فەرمانی ئیمەدان 1920 [5].

"من بەوبۆچوونی ئێوە سەبارەت بە کێشەی کورد دەزانم، کاتێك کە ئەمە دەنووسم مەبەستم لێی گەیشتنە بە بڕیارێکی زیاتر جەخت لە سەر کراو. داماد فەرید هاتە لام و گوتی بەپێی رێکەوتننامەی ئاشتی کورد دەبێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ . کوردەکان مستەفا کەمالیان خۆش ناوێت چونکە دەیەوێت بەلشەفیك بهێنێت، ئێوەش رقتان لە مستەفا کەماڵە چونکە ئەو رێکەوتننامەیە رەت دەکاتەوە کە ئێوە بنیادتان ناوە، لەبەرئەوە با کورد دژی مستەفا کەمال بەکاربهێنرێت[5] "

"ناکۆکی نێوان سوننەو شیعە گەورەیە. ئێمەش دەتوانین درزی ناکۆکی نێوانیان زیادو فراوان بکەین. تواناش هەیە لەرێگای تەفلیسەوە پەیوەندی لەگەڵ مستەفاکەمال بکەین. ئێمە چاوەروانی فەرمانی بەرێزتانین1920"[6]

ئەمە هەمووی راپۆرتی بەرزکراوەیە لەلایەن ئینگلیزەوە بۆ سەرۆکایەتی وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا سەبارەت بە باری ئابوری و کۆمەڵایەتی و



سیاسی و رۆشنبیری هەرێمەکە. لەم بەڵگەنامانەشەوە ئێمە تێدەگەین کە بەریتانیەکان دژی بەرژەوەندی دەوڵەتە ئیمپریالیەکانی تر لە ئەنادۆڵدا. گرنگترینی ئەم هەلانەش کە ئەوان قوستوویانەتەوە ئەو پێکدادانە شاراوە چاوەروانکراوانەی هێز بووە لە سروشتی خێڵایەتی کوردیدا . هەروەها پێکدادانە مەزهەبییەکانیش لەنێوان ئەو خێڵانەداو لە ئاکامی ئەوەشدا بەکارهێنانیان لە بەرژەوەندی خۆی. ئەم سیاسەتەی پارچە پارچە کردن و بەو پێیەش پارچەپارچەبوون و پەرتپەرت بوون بەتەواوەتی هاوشێوە بووە لەگەڵ سیاسەتی "پەرتکە و سوود وەرگرە کە سیاسەتی دەرەکی بەریتانیەکاندا کە لە کۆنگرەی بەرلینی ساڵی (1878)ەوە پیادەیان کردووە "

بێگومان ئەمپریالیزمی ئینگلیزی لەم کارەدا سەرکەوتوو بووەو پەیوەندی چڕی لەگەڵ چینە دەسەڵاتدارەکانی ئەنادۆڵی رۆژهەڵاتدا بەستووە لەراستیشدا دەگوترێت لە جێبەجێ کردنی ئامانجەکانیدا ژمارەیەك لە خێڵەکانی بە فیعلی جوڵاند. بیرۆکەی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان بە ئاشکرا لە سەر مێزی گفتوگۆ لەسەر کردن لە کۆبوونەوەکانی پەیمانی سیڤەردا سەبارەت بە کوردستان بەمجۆرەی خوارەوە بوو:

لیژنەی پێکهاتوو لە ئەندامانی دەوڵەتانی هاوپەیمان ئۆتۆنۆمی ناوخۆ جێبەجێ دەکەن لەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی فورات و پاشماوەی ئەو ناوچەیە کە دەکەوێتە نێوان عێراق و سوریاوە دوای تێپەربوونی ساڵێك بەسەر ئیمزاکردنی رێککەوتننامەکەدا کوردەکان ئەگەر توانیان لە رێگای گەرانەوە بۆ لای کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە بیسەلمێنن کە زۆربەیان دەیانەوێت لە تورکیا جیاببنەوە و کۆمەڵەی نەتەوەکانیش ئەمەی پەسەند کرد ئەوا لەسەر تورکیا پێویستە دەستبەرداری هەموو مافەکانی خۆی بێت لەم ناوچەیەدا". لە بەشی سێیەمی پەیمانی سیڤەردا، باسی مەسەلەی کوردستان دەکرێت بابەتەکانی ئەم بەشەش بەندەکانی (62، 63، 64)ە کە پەیوەستن بە کوردستان کەبەمجۆرەیە. بەندی (62) دەڵێت: لیژنەیەك کە پێکدێت لە نوێنەری حکومەتەکانی ئینگلتەرەو فەرەنساو ئیتالیا بنکەی خۆی لە ئەستەنبول دادەنێ و دەسەڵاتی پێدەدرێت لەلایەن دەوڵەتەکانەوە کە بەپێی پەیرەوی ناوخۆی سەرۆکایەتی پەیمانی سیڤەر لە ماوەی مانگێکدا بەپێی ئەوەی دواتر دیاری دەکرێت، نەخشەی ئۆتۆنۆمی ناوچەیی ئامادە بکات بۆ ئەو ناوچانەی کە دەکەونە رۆژهەڵاتی فورات و نێوان باشوری ئەرمینیاو باکوری سوریاو نێوان دوو رووبارەکە بەو جۆرەی کە دواتر سنوورەکەی دەکێشرێت کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن.ئەمەو بەپێی برگەکانی مادەی (27)و لە کاتی نەگەیشتن بە دەنگدانی گشتی سەبارەت بە هەر بابەتێك، دەبێ هەر ئەندامێك دەوڵەتەکەی لەو بارەیەوە ئاگاداری بکاتەوە. پێویستە ئەم نەخشەیە زەمانەتی ئاشوریەکان و کلدانیەکان و کۆمەڵە ئیتنیکیەکانی ترو سەرجەم مافەکانی کەمایەتیەکانی تر بکات. بۆ ئەم مەبەستەش لیژنەیەك پێکدێت لە نوێنەرایەتی ئینگلیزو فەرەنسیەکان و ئیتالیەکان و فارسەکان و کورد. ئەم لیژنەیە دەست دەکات بە لێکۆڵینەوەو وردبینی کردنی ناوچەکەو هەر گۆرنکاریەك کە رووبدا چی لە سنووری ئێران یان لە سنووری تورکیا بە هەمان شێوە. ئەمەش بەپێی ناوەرۆکی پەیمانەکە دەکرێت".

بەندی (63)حکومەتی تورکی لە کاتی ئاگادارکردنیەوە لەلایەن یەکێك لەم لیژنانەوە ئەو فەرمانەی لە ماوەی دیاریکراوی سێ مانگدا جێبەجێ دەکات.

بەندی (64) لەو مێژووەوە کە سەرۆکایەتی پەیمانی سیڤەر دیاریکردووە گەلی کورد، واتە زۆرینەی زۆری ئەم گەلە کە لەو ناوچانەدا نیشتەجێن کە بەندی (62)ی پەیمانەکە دەیانگرێتەوە ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا ئارەزووی خۆی بۆ سەربەخۆیی تەواوەتی و جیابوونەوە لە تورکیا راگەیاندو پەیوەندی کردووە بە کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە و کۆمەڵەی نەتەوەکانیش قەناعەتی بەوە هێنا ئەوا رێنومایی بۆ جێبەجێکردنی ئارەزووکانی ئەم گەلە بۆ سەربەخۆیی لە ناوچە دیاریکراوەکاندا و جێبەجێکردنی پێشکەش دەکات لەم کاتەدا



تورکیا بەڵێن دەدات بە جێبەجێکردنی ئەم رێنومایییە وەکو خۆی و دەستبەرداری هەموو دەسەڵاتێکی خۆی دەبێت سەبارەت بە گەلانی ئەم ناوچانە.

بەڵام وردەکارییەکانی کاری دەستبەرداری تورکیا لەوناوچانە راستەوخۆ دەبەسترێت بە رێککەوتنێکی تایبەتەوە لەنێوان هێزی هاوپەیمانان و تورکیادا. دوای تەواوکردنی کاری ئەم دەستبەردار بوونە و بەدیهاتنی سەربەخۆیی کوردستان، هێزەکانی هاوپەیمانان دژی ئارەزووی ئەو کوردانە

نابن کە لە ویلایەتی موسڵ دەژین وا ئەو ولایەتەش تاکو ئەمڕۆ بەشێکە لە کوردستان بۆ یەککگرتنەوە لە لەگەڵ ئەم دەوڵەتە کوردیەدا.

شەڕی رزگاری نەتەوەیی کە تورکیا هەڵیگیرساند بەرپەرچدانەوەیەك بوو بۆ ئەو ئەنجامانەی لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم لە ئیمزاکردنی پەیمانی سیڤەر کەوتنەوەو بە پارچە پارچە بوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کۆتایی هات، کە ئەوەش بووە پێشەنگی بەرگری‌و خەباتی گەلانی تر دژی زوڵم‌و زۆر، بەڵام سیاسەت‌و هەنگاوە هەڵەکان کە وەرگیراون بە دەرکردنی ئیمپریالیزم لە تورکیا دەرگای لە رووی دەستتێوەردانی ئیمپریالیستە بەهێزەکاندا خستە سەرپشت وەکو چۆن پێشتر دەستیان لە کاروباری وڵاتەکەمان وەردا. دەبێ ئەوەش بگوترێت کە ئەم یاریکردنەی ئیمپریالیستەکان تەنیا تورکیای نەگرتۆتەوە بەڵکو قۆچی لە هەر وڵاتێك گیرکردووە کە شایانی ئەوە بووبێت تیایدا بەدوای بەرژەوەندیەکانیدا بچێت. ئەو رێکەوتنە فیعلیەی کە فەرەنسیەکان‌و ئینگلیزەکان لە نێوان خۆیاندا سەبارەت بەدابەشکردنی رۆژهەڵاتی ناوەراست بەستیان،ناوەرۆکێکی شاراوەی ئاشکرانەکراوی ئیمپریالیستەکان بەرامبەر بە کورد دەردەخات. ئایا شتێك هەیە سروشتیتر بێت لە بیرکردنەوەی ئیمپریالیستەکان لە بەرژەوەندییەکانی خۆیان و بۆ ئەم حاڵەتەش، ولایەتی موسڵ کە بەشێکە لە کوردستان بخرێتە دەرەوەی سنووری کوردستان. یان دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردی یان دروست نەکردنی ئەو دەوڵەتە؟.

موزەفەر ئەرەدۆست کە لێکۆڵینەوەی یاری کردنی ئیمپریالیستەکانی بە خێڵە کوردەکانی هەرێمی شەمدنیلی کردووە دەگاتە ئەم دەرەنجامە : لەنێو خێڵەکانی شەمدنیلیدا چەند چینێك هەن کە دەیانەوێت خاوەنی زیادەی بەرهەم‌و زیادەی ئەو تەقەلایە بن کە لە ئەندامانی خێڵەوە بەپێی پێگەی کۆمەڵایەتی و بە رێگەی بێگارچێتی وەکو باج بەدەستی دێنن. هەروەك لەنێو ئەم خێڵانەدا دیسان چین‌و توێژی کۆمەڵایەتی هەن کە لە ململانێی بەردەوامدان هەتا کاتی نووسینی ئەم دێرانە. پاشان موزەفەر ئەرەدۆست بەدوای سەرچاوەی ئەم ململانێ‌و ناکۆکیەدا دەگەڕێت کە ئایا لەنێو بونیادی خێڵەکاندایە یان نا. ئەویش بەمجۆرە ئەنجامگیریە دەردەبڕێت: ئینگلیزەکان کە دوای راپەڕینی ئەهری ساڵی 1925 پەیوەندیان بەست‌و جڵەوی پێشنیاریان خستە دەستی خۆیانەوە خەڵکی هەردوو خێڵەکانیان لە ناوچەکە دورخستەوە. لە ساڵی 1930دا بەشێکی ئەو راپەڕین‌و هێرشانەی کە لەسەر سنوورەکانی ئێران‌و عێراق و سوریا دەستیان پێکردبوو گواستەوە بۆ شەمدنیلی. ئەوەش بوو بەهۆی کۆچکردنی خەڵکەکەی بۆ ناوچە جۆراوجۆرەکان، بنەمای ئەم ناکۆکیە پشتگیری دەکرێت بەهۆی ناکۆکی وڵاتانی ئیمپریالیزمەوە بەدوای دابەشکردنی بازارەکانی جیهان لەنێوانیاندا. بەمجۆرە، ئەم رووداوانە گواستنەوەیان لەو شێوە داینامیکیەی کە لە بونیادی خێڵەکانی شەمدنیلیدا هەبوو کە گواستنەوەیە لە پەیوەندیەکانی دەرەبەگایەتیەوە بۆ پەیوەندیەکانی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری شێواندو کاریان کرد بۆ دواخستنی.

**سەرچاوە:**

**النظام فی الاناضول الشرقية**

**الجزء الثانی ص 80-85**

**و: عەتا**

**تێبینی**

**پێشکچی قسەکانی (ارول اولو بلنی) لە کتێبی (تورکیا لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی بەریتانیادا) چاپی ئەستەنبوڵ وەرگرتووە.**



# بارودۆخی سیاسی کوردستان و گەلی کورد

وەرگێڕانی: [illegible]

بارودۆخی سیاسی کوردستان لە بارودۆخی ولاتانی داگیرکراو ناچێت، هەروەك لە بارودۆخی ولاتانی نیمچە داگیرکراویش ناچێت. بەڵکو بارودۆخی کوردستان لە خوار ئاستی ولاتێکی داگیرکراویشەوەیە، گەلی کورد لە بارێکدایە جیاوازە لە باری گەلێکی داگیرکراو. بارودۆخی سیاسی کوردستان و گەلی کورد لە ئاستێکی دیاردا جیاوازن لە بارودۆخی ولاتانی داگیرکراو. کوردستان بارودۆخێکی سیاسی دیاریکراوی نییە، هەروەك خاوەنی هیچ ئاسنامەیەکی سیاسیش نییە. کورد ئەو گەلەیە کە دەیانەوێت تا ئاستی کۆیلایەتی تێکیبشکێنن و ئاسنامەکەی هەڵبوەشێننەوە. بە قسەیەکی ئاشکراتر دەیانەوێت کورد لەسەر ڕووی زەوی بوونی نەمێنێت. بەڵام گەلی کورد بەو بارودۆخە ڕازی نییە یان ڕاستتر بڵێین ئەم بارودۆخە ڕەت دەکاتەوە کە لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەوە ئیمپریالیستەکان و هاوکارەکانیان لە ڕۆژهەلاتی نزیکدا خستویانەتە ناوییەوە. بە مەبەستی بەدەست هێنانی ئازادی، کوردەکان پەنایان دەبەنە بەر هەموو جۆرە هۆکارێکی لەبەردەستابوو بە خەباتی چەکداریشەوە.

لێرەوە پێویستە لەسەرمان ئامانج لە چەمکی "دوڵەتە ئیمپریالیستەکان و هاوکارەکانیان" ڕوون بکەینەوە. ئەو دوڵەتانەی کە هاریکاری دەوڵەتانی ئیمپریالیزم دەکەن بۆ وێرانکردنی کوردستان و بەکۆیلەکردنی گەلی کرد خاسێتی دەوڵەتی داگیرکەریان هەیە ئەمەش لەسەر بنەمای ئاکۆکییە لە هاریکاریدا لە نێوان ولاتانی جۆراوجۆرو دەوڵەتانی ئیمپریالیدا لە بوارە دیاریکراوەکاندا. لە ناو ئەوانەشدا، بەستنی هاوپەیمانێتی سەربازی لەگەڵیدا، وەکو چۆن زۆر لە ولاتانی دوای جەنگی دووەمی جیهانی کردیان، بۆ نموونە هاریکاری میسر لەگەڵ ولاتە یەکگرتوەکاندا، بەڵام هاریکاری ولاتانی وەکو تورکیاو عێراق و ئێران و سوریا بەشێوەیەکی هەمیشەیی لەگەڵ دەوڵەتانی ئیمپریالیدا لە میانەی داگیرکردنی خاکی کوردستانەوە ئەم دوڵەتانە یان کوردستانیان داگیرکردوە یان خاکی کوردستان بەستراوەبە خاکی ئەوانەوەو کراوەتە پاشکۆی.

دیارە گومانی تێدا نییە کە ئەم بارانەی کە دێن بە دەوری خۆیان بەسەر کوردستاندا پیادە دەکرێن. کەڵك لە ناوچە داگیرکراوەکان وەردەگیرێت وەکو سەرچاوەی مادەی یەدەکی مادە خاوەکان، لەکاتێکدا سامانەکانی ژێر زەوی لە جۆری نەوت و خەڵوزو فۆسفات و مس و سامانە سروشتیەکانی تریش وەکو دارستان و ئاو بەکار دەهێنرێت. هەروەك ئەم ناوچە داگیرکراوانە بازاڕێك بۆ بەرهەمە دروستکراوەکان پێکدێنێت. بەڵام لە کوردستان خاسێتی تر هەن کە ناشێت ئەو خاسێتانە لە ولاتانی داگیرکراودا بەشێوەی تەقلیدی ببینرێن. ئەم خاسێتانە ڕۆڵێکی بنەڕەتیان بینیوە لە شێواندنی ئاستی بارودۆخەکە لە کوردستاندا بۆ ئاستێکی نزمتر لە بارودۆخی ولاتێکی داگیرکراو. ناشێت تێبینی ئەو تایبەتمەندیانە لە ولاتانی داگیرکراوی تەقلیدیانەدا بکرێت بەڵکو ئەوانە تایبەتمەندن بە کوردستان. بۆ ڕووناکی خستنە سەر پەیوەندیەکانی نێوان بەریتانیاو ئوگەندا، ولاتێك هەیە ناوی ئوگەندایە، ولاتێکی داگیرکراوە، سنوورەکانی ئەم ولاتە زانراوو دیاریکراوە. گەلێکیش هەن لەم ولاتەدا دەژین، گەلێکی غەیرە بەریتانین و ئوگەندا بەشێك لە بەریتانیا پێکناهێنێت. هەروەك هیچ هەوڵدانێك لە ئارادا نییە بۆ گۆڕینی ئەم گەلە بۆ گەلێکی بەریتانی، کاتێ ئوگەندا لە ڕێگای دانووسانی دەستوریەوە لە کۆتایی شەستەکاندا سەربەخۆیی بەدەست هێنا، سنوورەکەی گۆڕانکاری بەسەردا نەهات. ئوگەندە لە سنووری دیاریکراوی خۆیدا ژیانی سەربەخۆیی بەڕێوەبرد. هەمان شت بەسەر پەیوەندیەکانی نێوان بەریتانیاو هەریەکە لە هیندو نیوزیلەندو کینیاو سۆماڵو بۆتسوانادا پیادە دەکرێت. هەروەك دەتوانین ئەو هێڵە سورە بدۆزینەوە لە پەیوەندیەکانی فەرەنسا لەگەڵ تونس و جەزائیر و مەغریبدا بوو، گەلانی ئەم ولاتە داگیرکراوانەش فەرەنسی نەبوون، هەوڵیش نەخراوەتە کار بۆئەوەی بکرێن بە فەرەنسی، ئەمەش ڕاستیەکە فەرەنسیەکان و هەروەها هاونیشتیمانیانی ئەم ولاتە داگیرکراوانەش وەکو یەك دەیزانن. هەمان شت بەسەر پەیوەندییەکانی پرتوگال و هەریەکە لە ئەنگۆلاو مۆزامبیق و غینیاو بیبیساودا دەسەپێنرێت.

جیاوازی گەورە هەیە لە دابەشکردنی ئەفەریقادا لە نێوان ولاتانی ئیمپریالیزمی ئەوروپیدا لەوانەش بەریتانیاو فەرەنساو بەلجیکاو هۆڵەنداو پورتوگالو ئیسپانیاو ئەڵمانیادا، لەگەڵ دابەشکردنی کوردستان و پارچە پارچەکردنیدا لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستدا لەلایەن دەوڵەتانی ئیمپریالیزمەوە لەوانەش فەرەنساوبەریتانیایە بە هاوکاری کەمالیستەکان و ئێران.

ئێستا لە ئەفەریقا نزیکەی پەنجا ولاتی سەربەخۆ هەیە. ئەم ولاتانە کە دەوڵەتانی ئیمپریالیزم لە ساڵی 1885دا سنوورەکانیان کێشا، لە چوارچێوەی ئەو سنوورانەدا سەربەخۆییان بەدەست هێناوە. بەڵام نەتەوەی کورد کە ژمارەیان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا دەگاتە سی (30) ملیۆن کەس، سەرباری ئەو ژمارە زۆرە بارودۆخێکی سیاسی پەسەندیشی بەدەست نەهێناوە ئەمەش ناچاری کردووە کە پەنا بباتە بەر خەباتی چەکداری وەکو هەوڵێك بۆ پاراستنی ئاسنامەکەی و ڕەتکردنەوەی ئەو شێوازانەی ئیمپریالیزم و ئستیعمارو ڕەگەزپەرستی کە فەرز کراوە بەسەریدا. هەروەها ئیمپریالیستەکان لە سەرەتای سەدەی بیستدا نەتەوەی عەرەبیشیان دابەش کرد، بەڵام سووربوون لەسەر دامەزراندنی چەندین دەوڵەتی عەرەبی ملکەچ بۆ ئینتدابی هەر کام لە داگیرکەران کە ئەمان پاشکۆ بوون بۆیان. لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی هەموو ئەم دەوڵەتە عەرەبیانە لە بەدەستهێنانی سەربەخۆییدا سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. لەم ئاستەدا جیاوازی گەورە هەیە لەنێوان دابەشکردنی عەرەب و دابەشکردنی کوردو پارچە پارچە کردنیدا، دەشێ بە هەمان ڕێگا سەیری دابەشکردنی ئەڵمانیاو کۆریاو ڤێتنام بکرێت. چەندین نەتەوە هەبوون کە بەردەوام ملکەچی دابەشکردن بوون، بەڵام ئەوەی تایبەتە بە کوردستان ئەوەیە کە کوردستان دوای هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەنێوان ئەو دەوڵەتانەی کە تازە پێکهاتن و دەوڵەتی ئێراندا دابەشکرا بۆئەوەی بە ڕێگایەکی ئاسانتر ئاسنامەی کوردو کوردستان لەناوببەن.

سەرچاوە :
کردستان مستعمرة دولية ص 23-25

# هەڵوێستی زانکۆی تورکی

## بەرامبەر کێشەی کوردو ڕەخنەی ئەم هەڵوێستە

لەساڵی *1930* دا، لەو ڕۆژانەدا کە هێشتا شۆڕشی نەتەوەیی کورد لە (ئاگری) بەردەوام بوو، (محەمەد ئەسعەد- بۆزکورت)، وەزیری دادی تورکی لە (ئۆدەمیش) لە ووتارێکدا لەبەردەم خەڵکدا، ئاوای دەگوت:

" ئێمە لە وولاتێکدا دەژین کە پێی دەوترێ تورکیاو ئازادترین وڵاتی دنیایە. نوێنەرانی ئێوە -مەبەستی ئەندامانی پەرلەمانە- ناوەندێکی لەمە گونجاوتریان بۆ باسکردنی ڕاستگۆیانەی بیروڕاکانی خۆیان دەست ناکەوێ. لەبەر ئەوە هەستەکانم ناشارمەوە. تورک تاکە (ئاغا)و تاکە خاوەنی ئەم وولاتەیە ئەوانەی لەرەگەزی تورکی ساغ نین، یەك تاکە مافیان هەیە: مافی خزمەتکاریو کۆیلەیی. با دۆستو دوژمنو چیاکانیش ئەم حەقیقەتە وەك خۆی بزانن"[1]

ئەگەر پێکەوە ئەم قسانەو قسەکانی (خەسرەو گەرەدە) لەگەڵ شای ئێراندا بکۆڵینەوە، سیاسەتی ڕژێمی کۆماری بەرامبەر کوردستانو نەتەوەی کورد، بەروونو ئاشکرایی دەردەکەوێ. (خەسرەو گەرەدە) یش لە ساڵانی (*30*) دا، وەك گەورە باڵیۆزی تورك نێردراوە بۆ ئێرانو لەسەرەوە بەشێکی قسەکانیمان پێشکەش کرد. کەوابێ وەزیری دادی[2] سەردەم دەڵێت "ئەوانەی تورك نین، واتە کوردەکان، تاکە یەك مافیان هەیە، ئەویش کۆیلەیی میللەتی تورکو خزمەتکاری میللەتی تورکە". لە ساڵی (*1923*) وە تا ئەمڕۆ، بەدرێژایی مێژووی ڕژێمی کۆماری، سەرلەبەری تواناکانی دەوڵەت، بۆ بەجێگەیاندنی هەموو پێویستی‌یەکانی ئەم سیاسەتە بەکارهێنراوە. هەموو هۆکارەکانی گوشاری مادی دەوڵەت، هەموو هۆکارەکانی گوشاری ئایدیۆلۆجی دەوڵەت، بەکورتی هەموو جۆرە توانایەکی دەوڵەت بۆ کۆیلاندنی (کۆیلەکردنی) نەتەوەی کوردو سڕینەوەی ناوی کوردو کوردستان لە زمانو مێژوودا، بەکارهێنراوە.



بێگومان دژایەتی نێوان نەتەوەی کوردو ئەو دەوڵەتە ئیمپریالیو کۆلۆنیالیانەی بۆ بەکۆلۆنی کردنو لەناوبردنی کاردەکەن، دژایەتیەکە هیچ سازشێك قبووڵ ناکات. بەلام ئەو قسانەی سەرەوە نیشانی دەدەن لانی کەم دژایەتیەکی سازش هەڵنەگر، لەنێوان وەزیری داد (مەحمود ئەسعەد- بۆزکورت) و نەتەوەی کورددا هەیە.

سەرباری هەموو ئەمانە کەسێکی ئاوا کۆکوژچی، کە بە ئاشکراو بەشانازی‌یەوە ڕەگەزپەرستی کۆکوژچێتی خۆی ڕاگەیاندووە، لە زانکۆی تورکیدا پەیکەری بۆ کراوە. ئەم پەیکەرە لە بینای کۆلیجی یاسای زانکۆی ئەنقەرەیە. ئەمە، بەشێوەیەکی دیارو ئاشکرا دەری دەخات کە نەتەوەی کوردو زانکۆی تورکی، دژایەتی (تناقض) ێکی چەند بەرفراوانو سازش هەڵنەگریان لەنێواندایە. پەیکەری کەسێك لەزانکۆدا دادەنرێ کە گوتوێتی "کورد تەنها بۆیان هەیە کۆیلەی تورك بن:" وە لەپێناوی ئەم بۆچوونو ئارەزووەشیدا هەرچی لەدەست هاتبێ ئەنجامی داوەو یارمەتی ئەنجامدەرانی داوە. ئەم فاکتە ڕوونی دەکاتەوە کە بۆچی دەرگای زانکۆی تورکی بەرووی گەڕانو لێکۆڵینەوە لەسەر فاکتی نەتەوەی کورددا داخراوە. ئەم فاکتە ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو بیروبۆچوونانەی بۆ شەرعیەتدان بەکاروکردەوەکانی ئایدۆلۆجیای کەمالیستی ڕەگەزپەرستو هاوکاری ئیمپریالیزم بەرهەم هێنراون، بۆچی وەکو "زانست" پێشکەش کراونو زانکۆی تورکیش وەکو "دراوی زانستی" ی گومان هەڵنەگرو بەگشتی وەك "زانست" قبوڵی کردوون.

زانکۆی تورکی ڕەنگە بتوانێ کۆشش بۆ بەرهەمهێنانی زانیاری زانستیانە لەبارەی چاخە دێرینەکانەوە بکات، ڕەنگە سەبارەت بە کۆمەڵگاکانی تریش زانیاری بەرهەم بهێنێ. بەلام پاش *1923*، هەموو ئەو زانیاریانەی لەبارەی

تورکیاوە بەرهەم هێنراون، بەشێوەیەکی گشتی، هیچ نرخێکی زانستیانەیان نیە. لەو گەڕانو لێکۆڵینەوانەدا کە سەبارەت بە بابەتی وەك: پەرەسەندنی مێژوویی، گۆڕانەکانی بونیادی کۆمەڵگە، مافە گشتی یەکان، دەستووری تورکی، سیستەمی حیزبە سیاسی یە تورکی یەکان، ئیدارەی گشتی تورکی، سیستەمی تاك حیزبی تورکی، بونیادی کۆمەلایەتی ئابووری تورکیاو پەیوەندی یەکانی نێوان ئەو دەزگا جۆراوجۆرانەی لەم بونیادەدا پێکهێنراون، پەیوەندی یە نێونەتەوەییەکان، مافی دەوڵەتانو کورد، فاکتی نەتەوەی کوردو دابەش بوونو پارچە پارچەکرانی کوردستانو پیادەکردنی گرنگترین سیاسەتی (پەرتکە- زاڵبە) لە جیهاندا، لەسەر کوردستانو نەتەوەی کورد، لەکاتی دابەشکردنی ئیمپریالیستانەی لۆزاندا، هۆشیارانە لەبەرچاو نەگیراون. لەم رووەوە هەر هەموو ئەو زانیاری یانەی لەم بابەتانەدا بەرهەم هێنراون، ناوەرۆکێکی ئیمپریالیو کۆلۆنیالیانەیان هەیە. ئامانجی ئەم زانیاریانە، بە ئاشکراو بەنهێنی بریتی یە لە سڕینەوەی ناوی کوردو کوردستان لە زمانو مێژوودا. زانکۆی تورکی لەم مەسەلانەدا، دەقاودەق لەگەڵ ئایدیۆلۆجیای کەمالیستدا یەك دەگرێتەوەو ئەوەمان وەبیردێنێتەوە کە لە (ئەدرنە)وە تا (هەکاری) هەموو کەس تورکەو "ئەگەر کەسێکی ناتورکیش هەبێ" پێویستە هەموو رێوشوێنێکی پێویست بۆ تورکاندنی (بەتورك کردنی) پەیڕەوی بکرێت، لەم رووەوە ئەو زانیاریانەی لە نووسینگەکانی رێکخراوی ئیستخباراتی تورکی (میت) دا بەرهەم دەهێنرێت، لەگەڵ ئەو زانیاری یانەی زانکۆ تورکی یەکان بەرهەمی دێنن، هیچ جیاوازی یەکی گرنگیان لەنێواندانیە. بۆ نموونە لەکاتی شۆڕشە نەتەوەیی یەکانی کورددا[ل] لەهەر پارچەیەکی کوردستان، سەرەك وەزیرو وەزیری دەرەوەو لێپرسراوەکانی تری تورکیاو ئێرانو عێراقو سوریا، بەردەوام کۆبوونەتەوەو لەگەڵ سەرەك وەزیرو وەزیری دەرەوەی ئینگلیزو فەرەنسادا دیدارو گفتوگۆی هاوبەشیان کردووە. کەچی تەقەللایەکی زۆریان کردووە بۆ ئەوەی ئەم دیدارو گفتوگۆیانە بشارنەوە. ئەگەر نەیشیان شاردبێتەوە بابەتی وەك "دابەشکردنی ئاوی فورات" یان بۆ کردۆتە بیانوو. لەکاتێکدا هۆو ئامانجی بنەڕەتی پەیمانی (سەعد ئاباد) و پەیمانەکانی دواتر، بریتی بووە لە باشتر کۆنترۆڵ کردنی کوردستانو بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، زانکۆی تورکی توانیویەتی لە قاڵبێکی تەواو جیاوازدا پێشکەشیان بکات.

ئەم پەیمانانە، کە ئامانجی سەرەکی یان پاراستنو چەسپاندنی بارودۆخی ئێستایە "الوضع الراهن" لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، گومانی تێدا نیە رێگە لەپەرەسەندنی بزووتنەوە سۆسیالیستەکان دەگرنو بزووتنەوە شۆڕشگێڕە دیموکراتەکان لەژێر گوشاردا دەهێڵنەوە. ئەم شێواندنو هەڵگێڕانەوەو دەمامك کردنە، بەهەمان شێوە لە سیاسەتی ناوخۆشدا هەیە. هەموو ئەمانە لەلێکۆڵینەوەی (مل ملانێی دابەشکردنی ئیمپریالیی لەسەر کوردستان (*1915-1925*)) دا دەخرێنە بەرباس.

زانکۆی تورکی هەوڵو ماندو بوونێکی گەورە سەرف دەکات بۆ ئەوەی کێشەی نەتەوەیی کورد لە رەهەندی کاتو شوێنی خۆیدا وەرنەگرێت (نەخاتە بەرباسو لێکۆڵینەوە). لەم مەسەلەیەدا لەبێدەنگی یەکی گەورەدایە. ئەگەر ئەو پرەنسیپە بنەڕەتی یە بەبیر بێنینەوە کە دەڵێ "فاکتەکان بەیەکتری یەوە بەستراونو پێکەوە لە پەیوەندی کار- کاردانەوەدان، بەنارەزوو یەکێك لە فاکتەکان لەوانی تر جیاناکرێتەوەو چاوپۆشی لێناکرێ"، بۆمان دەردەکەوێ کە بوونی فاکتی نەتەوەی کورد لەناو کۆی پەیوەندیەکانداو چۆنی یەتی کارکردنی لەوانی ترو کارتێکرانی لەلایەن ئەوانەوە، ناچنە ناو پرۆسەی فکرو تێگەیشتنەوە. ئەم بێدەنگی یە بێدەنگی یەکی هۆشیارانەیە. چونکە زانکۆی تورکی زانکۆی رژێمە. لەگەڵ ئایدیۆلۆجیای بالادەستی رژێمدا یەکی گرتووە. باوترینو جێمتمانەترین رەفتاری رژێمیش بێدەنگی یە. بێدەنگی یەکی هۆشیارانە لەم رووەوە ماوەی نزیکەی (55) ساڵ، زانکۆی تورکی بەپێویستی نەزانیوە هیچ راستکردنەوەو گۆڕانێك بەسەر ئەم هەڵوێستە نازانستیو دوگمایەی خۆیدا بێنێ.

پتر لەوەش ئەوەندە لەگەڵ ئەم هەڵوێستە نازانستی یەدا راهاتووە، ئەوەندە لەگەڵیدا یەکی گرتووە، ئەوەندەش بڕوای بەوە کردووە کە ئەم بارودۆخە



تابێ‌پایـان بـەردەوام دەبێـت، کـە تەنانـەت لەگـەڵ ڕێکخـراوە نهێنی‌یـەکانی دەوڵەتیشدا لەپێناوی پاکتاو کردنی (تصفیە) زانکۆکاندا لەو کەسانەی دیدو بۆچوونیـان لەگـەڵ ئایدیۆلۆجیـای ڕەسمیـدا ناگونجـێ، هاوکـاری دەکـات. زانکۆی تورکی کە خاوەنی دیدو بۆچوونێکە لەناو چوارچێوەی ئایدیۆلۆجیای ڕەسمیدا بەباشی دۆگما بووەو دەقی گرتووە، ناتوانێ خۆی لەوە لابدات کە جارجـار وەکـو نووسـینگەیەکی ڕێکخـراوی ئیسـتیخباراتی میللـی (میـت) کاربکات. لەم ڕووەوە کاتێك زانکۆ بیروبۆچوونی خۆی سەبارەت بە چۆنیەتی سەردەمی تاك حیزبی پێشکەش دەکات، بەهیچ جۆرێك ئەو سیاسەتەی کە کەمالیزم بەرامبـەر کوردسـتانو نەتـەوەی کـورد پـەیڕەوی کـردووە، نابینـێو نایەوێ ببینێ. زانکۆی تورکی ڕەنگە بتوانێ کارەکانی هیتلەرو مۆسۆلۆنی‌و پەیوەندی‌یە کۆلۆنیالی‌یەکانی (سالازار) لە ئەفریقا هەڵبسەنگێنێ، بەڵام بەهیچ جۆرێك ناتوانێ پەنجە بۆ کارەکانی کەمالیزم لە کوردستاندا بەرێت. ناتوانێ ئەوانە هەڵبسـەنگێنێ. وەکو بۆرجوازی‌یە کۆلۆنیالی‌یە عەسکەریەکانی خـۆی، بە (نەبوو) یان دادەنێ. درێژە بە بێدەنگی خۆی دەدات، چونکە ئەوەی چینە بـالا دەسـتو هـێزە باڵادەستەکان دەیانـەوێ، ئەمەیـە: بێدەنگـی. بێدەنگـی. بـاوترینو جێ‌متمانـەترین ڕێگـەی سـووربوونە لەسـەر دۆگمـاتیزمو بەردەوامی لەسەر هەڵە.

لەناوەندێکدا (وسط) کە زانکۆو پرۆفیسـۆرەکان لەگـەڵ ڕژێمـدا ئـەومەندە یـەکیان گرتبێ‌و هـەوڵیان دابێ ئایدیۆلۆجیای ڕەسمـی بـە (زانسـت) دابنێـن، شـیعری (سـێ‌و سـێ گوللـە) ئـەرکێکی زۆر گرنگـی کەوتۆتـە ئەسـتۆ. نابـێ ئـەوەشمان لـەبیر بچێ کە ئەم شیعرە لەلایەن خوێندکارێکەوە کە تازە چۆتـە زانکۆ لە سالانی 1948 1950 دا نووسراوە. واتە لەسەردەمێکدا کە فێربوونو فێرکردنی مارکسیزم قەدەغە بووە. با ئەوەش بڵێین شیعرەکە ڕووداوی "سێ‌و سێ گولله" ناگێڕێتەوە. ئەم شیعرە لاواندنەوەیەکە بۆ گوللەبارانکراوەکان. لە شیعرەکەوە ناتوانین تەنانەت کاتی ڕوودانی ڕووداوەکەش بزانین. بەڵام لەناو خوێنەرانی کورددا بە تایبەتی، پرسیاری کاریگەرو بەردەوام دەوروژێنێ (ئەم سـێ‌و سـێ کەسـە کێـن؟)، (بۆچـی گوللـەباران کـراون؟)، "تـاوانی گوللـەبارانکراوەکان چـی بـووە؟"، "ڕوداوەکـە کـەی ڕوویـداوە؟"، "ئـەو خێزانانـەی کوڕەکانیـان کوژراوە چی‌یـان کـردووە؟"، "دوای حـەقی خۆیـان کـەوتوون، چـۆن دوای کـەوتوون؟"، "دەوڵـەت بەرامبـەر ئـەم ڕووداوە چـی کردووە؟". گوللەبارانکەرەکان بەسزای خۆیان گەیشتوون؟"، "ڕووداوەکە چۆن هاتۆتە ئاراوە؟"، "ئایا گوللـەبارانکردنی تـری لـەو جـۆرە لەبەشـەکانی تـری تورکیاشدا بووە؟"، "بۆ نەبووە؟"، "بۆ لە خۆرهەڵات بـووە؟"، هتد ئـەم پرسیارو گەڕانە (بحث)، سەرەتا لە خێزانەوە دەست پێدەکا. پاشان کەس‌و کارو، گوندو شارۆچکە، ئەلقە بەئەلقـە پـەرە دەسـتێنێ. پرسیارو گـەڕان تـا زانکۆ درێژ دەبێتـەوە. گەشەسەندنی پرۆسەی پرسیارو گەڕان کاریگەریەکی گـەورە لـە مەسـەلەی پێکهاتنی هۆشیاری سیاسـی لـەناو کۆمـەڵی کوردیـدا درووسـت دەکـات. لەراسـتیدا ئـەو کەسـەی چۆتـە نـاو پرۆسـەی پرسـیارو گەڕانەوە سەبارەت بە ((سێ‌و سێ گولله)) خۆبەخۆ بووە بە خاوەنی زانیاری سەبارەت بەو سیاسەتانەی تریش کە بەرامبەر کوردستانو نەتـەوەی کـورد پەیڕەوی دەکرێن‌و بە بارودۆخی کۆمەڵگەکەی خۆی هۆشیار بۆتـەوە. چونکە لەپرۆسـەی پرسیارو گـەڕاندا (بحـث) ئەوانـەی لەگـەڵ ڕووداوەکـەدا ژیـاوونو دەیزانن‌و بیستوویانە، تەنها ڕووداوی "سێ‌و سێ گولله" ناگێڕنەوە. بـەڵکو یـەك بەیـەکی ئـەو ڕووداوانـەش کەهاوشـێوەی ئـەون. شۆڕشـەکانی کـورد، ڕاگواستنەکان، ئاگری، زیلان، ساسۆن، ئیحسان نوری، سەید ڕەزا، بەرزنجی‌و سمکۆ، یەك بەیەك دەگێڕنەوە.

دیسـان لـەم پرۆسـەی گەڕانەدا تێدەگـەن کـە زانکـۆی تورکـی، "چـەپ" ی تورکی، نووسەرانو هونەرمەندانی تورك، چەند بێ‌خـەم "لامبالاة" و بێگانـەن بـە کێشـەکانی کۆمـەڵگای کـوردی. لەبـەر ئـەوەی وەڵامـی ئـەو جـۆرە داهو دەزگایانە بۆ ئەو جۆرە پرسیارانە بێجگە لە "نازانین، گرنگ نی‌یە" هیچی تر نی‌یـە. یـاخود لـەژێر نـاوی "پێشـکەوتنخوازی" دا، پڕیـەدەم جنێـودان بـە بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردو جوڵانەوە بە ئاراستەی ویستو ئیرادەی چینە باڵادەستەکانی تـورك وەکـو لـە نمونـەی دەرسـیمدا باسمـان کـرد، (حەسـەن عـیزەدین دینـامۆ) و (باربـارۆس بایکـارا) و (کـەمال بیلباشـار) و گـەلێکی تریشـیان، لـەوجۆرە نووسـەرە جنێوفرۆشـانەن. ئەمانـە هەمیشـە لەگـەڵ ئایدیۆلۆجیای ڕەسمیدا گونجاونو لەگەڵیدا یەکیان گرتووە. سەرەڕای ئەوە، بەناوی هونـەرەوە پڕوپاگەندەشیان بۆ ئـەم ئایدیۆلۆجیایـە کـردووە هـەوڵیان داوە لەبـەرئەمی (بورجـوازی تـورك) ی کۆلۆنیـال میلیتـاریدا، شـەرعیەت بەدەست بێنن.

*لەم ڕووەوە، لەناوەندێکی ئاوا پیسو بۆگەندا، شیعری "سێ‌و سێ گولله" وەك شەماڵی کوێستان وایە. دڵ دەکاتـەوە. دیارە چاوەڕێ ناکرێ شـەماڵێکی وا، هـەموو پیسو چەپەڵی‌و بۆگەنی‌یەکان ڕامالێ‌و گسکیان لێبدات. بەڵام سـەرچاوەیەکی گرنگـە بـۆ سرووسـتبوونی ئەوژمـە بـەردەوامو بـەهێزەکان. هەڵسەنگاندنی شیعری "سێ‌و سێ گولله"، تەنها وەك بەرهەمێکی ئـەدەبی، ڕاست نی‌یە. "سێ‌و سێ گولله" زۆر زۆر لەوە تێپەڕیوە کە تەنها بەرهەمێکی ئەدەبی بێ‌و لەگەڵ کۆمەڵدا یەکی گرتووە.*

تێبینی: لە کتێبی "سێ و سێ گولله"وە، وەرگیراوە.

وەرگێڕانی: ئاسۆس هەردی.

**پەراوێزەکان:**

*Milliyet, No: 1655, 19 Eylul 1930, Ayricabk. L.Rombout, Kurtler Cagdas Kurdistan Tarihi (1918- 1946), Cev. Ronahi, yayinlari, Ekim 1972, S. 34-35.(1)Ronahi*

(2) هـەندێ کەسـی سـەر بـە (چـەپ) ی تورکـی، (مـەحمود ئەسـعەد بـۆز کـورت) وەکـو (چـەپ) ێکـی رادیکـاڵ هەڵدەسەنگێنن. ئەم مەسەلەیە لە لێکۆڵینـەوەی پرۆگرامـی (پ گ ك)دا دەخرێتە بەرباس.

(3) نووسەر هەموو جووڵانەوەکانی کورد بە وشەی (*Direnis*) واتـە (بـەرگری-مقاومـە) ناودەبـات. بـەڵام لـەو ڕووەوە کـە خوێنـدەواری کـورد خـۆی بە (شـۆڕش) نـاوی بـردوون، وام پـێ باش بوو ئـەی گـۆڕم بۆ ئـەوەی خوێنـەر سـەری لێتێك نـەچێ، ئەگەرچی بەلای منەوە تەعبیرەکەی نووسەر زیاتر پڕبە پێستی جووڵانەوەکانی کوردە.

# چەپی تورکی و کێشەی کورد

پێمان وایە لەم قۆناغەدا شتێکی بەسوودە هەڵوێستی چەپی تورکی سەبارەت بە کێشەی کورد بخەینە ڕوو

دەشتوانین ئەوە لەسەر دوو ئاست ئەنجام بدەین. لە ساڵانی شەستەکاندا واتە دوای کودەتای 1960/5/27 و لەو قۆناغەدا کەچەپی تورکی تیایدا پەرەی دا بە دەستکردن بە گفتوگۆ کردنی کۆمەڵە بابەتێك لەمێوانیاندا کێشەی کوردیش، ئەگەر ئاراستەی ئەم کێشەیەی دیاری کردبێت و،ئەگەر زۆربەی ئەم گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوانە لە سنوورێکی دیاریکراودا بووبێت لە زۆربەی کاتدا بەو مەبەستەی کە تورکە کەمالیەکان بێزار نەبن، ئەوا پێویستە لەسەرمان ئەم دیاردەیە وەکو هەوڵێکی پەسەند دابنێین. هیچ زیانە ڕۆییەك نییە ئەگەر بگوترێت ئەم دیاردەیە بەهۆی بوونی کوردەکانەوە بووە. واتە ئەو ئەندامە شۆڕشگێڕانەی کەبەڕەگەز کوردبوون و ئەندام بوون لەسەرجەم بزوتنەوە سیاسیەکاندا. چەپی تورکی لەبەرامبەر کێشەی کورددا هەڵوێستێکی کەمالیستیانەی تەواوی لە ساڵانی بیست و سی‌یەکاندا بیناکردووە، بە جۆرێك کە دەتوانین بڵێین چەپی تورکی لەو قۆناغەدا هەڵوێستی بە دژی کورد وەرگرتووە.

مەودای دووەمی ئەم بابەتە پەیوەندی هەیە بە کاریگەرییە خراپەکانی چەپی تورکی‌یەوە لەسەر بزوتنەوەی کورد ئەم کێشەیەش دەبەسترێت بەو گرنگیتی و بەهایەوە کە دەخرێتە پاڵ وشەی (مەیلی نەتەوایەتی) لەبەر ئەوە ئەو بیرانە پەیوەست دەبن بە پەرەسەندنە کۆمەڵایەتی و سیاسیە فرە جۆراو جۆرەکانەوە. تورکەکان نەتەوەیەکی باڵا دەستن، لەبەرئەوە بەسروشتی کێشەیەك لە ئارادا نی‌یە پەیوەندی بە نووسین و قسەکردن بەزمانی تورکی‌یەوە هەبێت، لە پای ئەوەش هیچ کێشەیەکی دیار پەیوەست بەو مەسەلە بوونی نی‌یە. دەتوانین ئەو خەڵاتە ئەدەبیانە وەك نموونە وەربگرین کە دەزگاکانی حکومەت یان کەرتی تایبەت یان دەوڵەت دەیبەخشن و لە ڕێگای دامەزراوە پەروەردەکانیەوە لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە بۆ زانکۆو لە ڕێگای بەڕێوەبەرایەتی گشتی زیندانەکان و سوپاو پۆلیس و ئێزگەو تەلەفزیۆنەوە هەوڵدەدات بۆ گەشەپێدانی زمان و ئەدەبی تورکی. گەشەپێدانی زمان و ئەدەبی تورکی گرنگی‌یەکی تەواو بۆ ئایدۆلۆژیای ڕەسمی پێکدێنێت.

بەڵام بەگوێرەی کوردەکان گەلێکی ژێردەستەن و بێ بەشن لەمافە نەتەوەیی و دیموکراتیەکانیان. کورد نەتەوەیەکی دابەشکراوو پارچە پارچەکراوە لە جەرگەی ڕۆژهەڵاتی نزیکدا. کورد ئەو نەتەوەیە کە هەموو دەوڵەتەکان بەشداریان کردووە لە سەر کوتکردنی بە ئاگایییە نەتەوەیی و دیموکراتیەکانیدا. دەوڵەتان هەموو ڕێ و شوێنێکی شیاوو چارەڕوانکراویان لەبەر گرتووە هەتا زمان و ئەدەبی کوردی پێ بشارنەوەو نەیهێڵن و نەتەوەی کورد لە بۆتەی نەتەوە دراوسێکاندا بتوێننەوە. بەمەبەستی گەیشتن بەم ئامانجە سەرجەم دامەزراوەکانی فشاری ئایدۆلۆژی دەوڵەتیان تەرخان کردووە واتە دامەزراوە پەروەردەیی‌یەکان و زانکۆو پارتە سیاسیەکان و دامەزراوە ئاینی‌یەکان و خێزان و ڕۆژنامەو ئێزگەو تەلەفزیۆن سەرجەم بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کراون.

کاتێکیش کە هەموو ئەم دامەزراوانە بەس نەبن بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە پەنا دەبەنە بەر پشت بەستن بە دامەزراوەکانی هێزو توندو تیژی واتە پۆلیس و زیندان و دادگاو هێزی چەکدارو درك و. تاد.

بۆ تێکشکاندنی بزوتنەوەی نیشتمانی کورد. چینی باڵا دەستی کوردیش نکۆڵی ناسنامەی نەتەوەیی خۆی دەکات، وەکو ئەوەی هەموو ئەو ڕێ و شوێنانە بەس نەبن بۆ بەدیهێنانی ئەو ئامانجە، چینی باڵا دەستی کوردی خۆی دەگۆڕێت بۆ چینێکی بەکرێگیراو لە ڕێگای ئەوەدایە لەناو چینی باڵادەستی تورکیدا بتوێتەوە. لەبارو دۆخێکی وەهادا شتێکی مەنتیقی دەبێت کە کۆمەڵی دیاریکراو دەست پێشکەری بەرگریکردن لە خاسێتە نەتەوەییەکان بکەن و دژایەتی ڕێ و شوێنی بەکارهێنراو بۆ سەرکوتانەوەیان بکەن. لێرەوە ئاسایی مەسەلەی ئارەزوو بۆ پاراستنی بەهای نیشتمانی وخاسێتە نەتەوەییەکان دێتە ئاراوە. بڕوامان وایە کە بەرگری کردن لەو بەهایانەو پاراستنیان لەو چوارچێوەیەدا کە بەکورتی لە سەرەوە باسمان لێکرد لە گرنگترین ئەرکەکانی شۆڕشگێڕان و دیموکراتیەکانە. دیارە کە چەپی تورکی ئابلۆقە بەسەر (مەیلی نەتەوایەتی)و بەسەر خەبات و پەیڕەوکردن لەبەرگری کردن لە بەها نەتەوەییەکان دەسەپێنێت. دیسان چەپی تورکی، شۆڕشگێڕو دیموکراتیستە کوردەکان تاوانبار دەکات بەوەی شۆڕشگێڕن و ڕەفتاریان مەیلێکی نەتەوەیی پێوەیە. ئەم جۆرە ڕەخنە گرتنانە تا ئەندازەیەکی گەورە کاری لە شۆڕشگێڕانی کورد کردووە. بیرمان دەکەوێتەوە لە ساڵانی شەستەکاندا کوردەکان نەیان دەوێرا تەنانەت هەر قسەش بە زمانی کوردی بکەن لە نێوان خۆیاندا ئەویش لە ترسی تاوانبارکردنیان بە مەیلی نەتەوایەتی، هەروەها توانای ئەوەشیان نەبوو کە بەبێ پەردە بڵێن کوردین کوردەکان لەو قۆناغەدا هەوڵێکی زۆریان دەدا هەتا بەدیمەنی زیاتر لایەنگری و دڵسۆزی مارکسیزم- لینینزمەوە دەربکەون، هەروەك تەقەلایەکی زیاتریشیان دەدا هەتا خاسێتە نەتەوەییە کوردییەکان نیشان نەدەن

هەروەها بیرمان دەکەوێتەوە لە ساڵانی پێش ساڵانی هەشتاکاندا شۆڕشگێڕی کورد بەوە تاوانبار دەکرا کە مارکسی لینینی نەبوو. ئەوەش وەکو سوکایەتی پێکردنێکی توند حساب دەکرا، لەبەر ئەوە ئەویش هیچ چارەیەکی نەبوو تەنیا ئەوە نەبێت کە وەها دەرکەوێت لە ئەوانی تر زیاتر مارکسی لینینی‌یە ئەو تیۆرییە بەلایەنی کەمەوە بەهۆی ناستی (پێگەیشتنیانەوە) کاریگەری خۆیی هەبوو و لەسەر ئەم بنەمایە هەرکەسێك ئاواتی (تو نەتەوەیەتای ئاراستە بکرایە هەستی بەسوکایەتی پێکردن دەکرد. ئەوان وایان دادەنا لە ڕووداوەستانی توندوتیژی و سەرکوتانەوە کە زمان و ئەدەبی کوردی دووچاری دەبێت و داواکاری سەربەستی قسەکردن بە زمانی کوردی و داواکاری دەوڵەتی سەربەخۆی کوردی لێدانێکە لە مەیلی نەتەوایەتی، لەلایەکی ترەوە بیرۆکەی مەیلی نەتەوایەتی بەکاردەهات وەکو تاوانبارکردنێکی ڕووت و تەواو بەتاڵ لە هەر ناوەڕۆکێك. ئەوان واتە چەپی تورکی جیاوازی ناکەن لە نێوان نەتەوایەتی‌نەتەوەی سەردەست و نەتەوایەتی نەتەوەی ژێردەست دا لەبەرئەوە پارسەلان تورکیش سەرۆکی بزوتنەوەی نیشتمانی قاضی و مەلا مستەفای بارزانی وەکو یەك دادەنێن. کەواتە ئەو سیاقە کۆمەڵایەتی‌یە- سیاسی‌یە کامەیە کە لەگەڵ مەیلی نەتەوایەتیدا جووت دەبێت؟ ئەی ئەوانە کێن کە دەشێ خاسێتی مەیلی نەتەوەیی بدرێتە پاڵیان؟ ئەی جۆری ئەو داواکارییانە چی‌یە کە دەیخاتە ڕوو؟

چەپی تورکی هەندێ کەسیان بە مەیلی نەتەوایەتی تاوانبار کردووە بۆ نموونە کاتێ ئەو کەسانە گوتوویانە پێویستە ئابلۆقەی سەپێنراو بەسەر

زمان‌و رۆشنبیری کوردیدا لاببرێت هەروەها پێویستە ئازادی، قسەکردن بە زمانی کوردی‌و نووسین بەو زمانە فەراهەم بکرێت. بەرگریکردن لە زمانی کوردی لە ڕووی سیاسیەوە بە لای ئەوانەوە ڕەگەز پەرستی‌و ئیستعمارییە. سیاسەتەکانی تواندنەوەو سڕینەوە کە دەوڵەتی تورکی پیادەی دەکات ئەرکی بنچینەیی‌یە. ئەمە پێویستە بە پێچەوانەوە بێت. پێویستە سنوورێکی جیاکەرەوە لە نێوان ئەتەوایەتی ئەتەوەی سەردەست‌و ئەتەوایەتی ئەتەوەیی بندەستدا دابنێین خستنەڕووی دروشمی (تورکیای سەربەخۆ) بەڵگەی گیانی شۆڕشگێڕی بوو، چەپی تورکی جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە ئەم دروشمە بیروکاری شۆڕشگێڕی بەڵام ئە وانەی لە بارەی کوردستانی سەربەخۆوە دەدوێن بە پێچەوانەی ئەوانەوە کە دروشمی تورکیای سەربەخۆیان بەرز کردۆتەوە) (ئەتەوەیین) بەڵام ئایا بەرزکردنەوەی دروشمی تورکیای سەربەخۆ لەناوەرۆکدا مانای ڕازی بوون نییە بەو دابەشکردنەی کە ئیمپریالیزم بەسەر کوردستانیدا سەپاند لە ساڵانی بیستەکاندا؟ توانراوە سیاسەتی (پەرتکەو کەڵك وەرگرە) دابنرێ‌و جێبەجێ بکرێت بەهۆی هاریکاری ئیمپریالیستەکانی ئینگلیزو کەمالیەکانەوە. کە هەوڵیان دا بۆ دانانی بەشێکی گرنگ لە کوردستان لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی تورکیدا. لەبەر ئەم هۆیە، واتە بەرزکردنەوەی دروشمی تورکیای سەربەخۆ، لە نێوان ئەو شتانەدایە کەماناو مەبەستی دانان‌و پشتگیری کردنی لەو سیاسەتە ئیمپریالیسی‌یەوە ومارەسە کردنیەتی ئەگەر توێژینەوەی بیرو ڕای چەپی تورکی‌و هەڵوێستەکانیمان سەبارەت بە کێشەی کورد کرد، پێویستە لە سەرمان بەشێوەیەکی تایبەتی جەخت لەسەر ئەم بابەتەی کەدێت بکەین: کورتی بیرکردنەوە لە کێشەکانی تورکیا لە ڕوانینی چینە کۆمەڵایەتیەکانەوە بەشێوەیەکی هەمیشەیی نابێت بەهۆی چارەسەرکردنە دروستەکان. دیسان پێویستە لە سەرمان لێکۆڵینەوەی ئەم کێشانە بکەین لە گۆشەنیگای کۆمەڵە ئیتنکی‌یەکانەوە. مارکسیەکانیش کە سورن لەسەر ئەوەی ئەوان چارەسەری کێشەکان دەکەن لە گۆشە نیگای ململانێی چینایەتیەوە بەو جۆرە رەفتار لەگەڵ کێشەی کورددا دەکەن کە خۆیان مارکسی تورکن. لەکاتێکدا دامەزراوە کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌یەکان‌و ئیتیفاقکردنەکان‌و ڕووداوە مێژووییەکان مانای جۆراوجۆریان هەیە ئەگەر لە تیشکە نیگای کۆمەڵە ئیتنیکی‌یەکانەوە سەیرمان کردن. لەبەر ئەم هۆیە دەبینین بیرو بۆچوونەکانی (مەهری بیلی) نموونەن بۆ ئەم شتە.

جەنابی مەهری بیلی یەکێکە لە سەرکردە مارکسیە- لینینی‌یەکانی چەپی تورکی‌و جێگایەکی گرنگ دەگرێت لە مێژووی ئەم بزووتنەوەیەدا.

مەهری بیلی گەنج بوو کاتێ تورکیای بەجێ هێشت‌و لە ساڵانی سی‌یەکاندا چوو بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان‌و لەوێ زانستی ئابوری خوێند‌و لە سەرەتای جەنگی دووەمی جیهانیدا گەڕایەوە بۆ تورکیاو چووە ڕیزی سوپاوە. بیلی ئەو کاتە واتە پێش ساڵی 1950 وەها سوپای دەبینیی کە دامەزراوێکی پێشکەوتنخوازی شۆڕشگێڕە. ئەوکاتە دەیگووت ئەرکی سەرشانی سۆشیالیست‌و کۆمنیستەکانە کە بچنە ناو سوپاوەو بەرگری لە وڵات بکەن دژی هێرشی نازییەکان. سوپای تورکی لەو کاتەدا بەشداری پەیمانی ناتۆی نەکردبوو، تورکیا ئەندام نەبوو لەو پەیمانە ناو براوەدا.

هەروەها جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە تورکیا پارێزگاری لەسەربەخۆیی خۆی بکات لەبەرامبەر ئیمپریالیزمدا.

بۆ هەر تورکێك یان هەر مارکسی‌یەکی تورکی دەشێ بەم جۆرە سەیری سوپا بکات، بەڵام ئایا کۆنیستێکی کوردی یان چەپێکی کوردی یان تەنانەت مارکسی‌یەکی کوردی ئەوە دەکات؟ ئێمە دەزانین چۆن سوپای تورکی ڕاپەڕینەکانی کوردو شۆڕشەکانی تێکشکاندووە لەو کاتەوە کۆماری تورکی دامەزراوەو لە هەردوو سەردەمەکاندا ئەو کارەی کردووە سوپای تورکی لە زیلان‌و دەرسیم تاوانی قەڵاچۆکردنی دانیشتوانی کوردی ئەنجام داوە، فڕۆکەکانی سوپای تورکیاو تۆپەکانی هەموو گوندەکانی ناوچەی (زیلان‌و دێرسی) سوتاندو



لەسەر نەخشەی بوون سڕینیەوەو دانیشتوانەکەی لە ناوەندە جۆراو جۆرەکانی دەست بەسەرکردن دەست بەسەر کردو پاشان گوللە بارانی کردن.

لە دەرسیم هەمان شێوەی ئەم قەسابخانە چەندین جار ڕوویداوە. دەوڵەتی تورکی هەموو جۆرەکانی ئازاردانی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی داوکارییە دیموکراتیەکان سەرکوت بکات و مافە نەتەوەییەکانی کورد هەڵبوەشێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئەو داواکارییانە لە نەخشەی کارکردنیدا نەمێنێت، بۆ ئەوەی گەلی کورد ناچاربکات واز لەو داواکارییانەی بهێنێت و بۆ ترساندنی لە هەڵەی داواکردنی ئەو مافانە. بەلام بۆ ئەوەی دەوڵەتی تورکی پشگیری کوردەکان لە شەڕی خۆی دژی یۆنانیەکان و ئەرمەن بەدەست بهێنێت لە نێوان ساڵانی 1919و 1921دا، سوپای تورکی و هەروەها بزوتنەوەی نیشتمانی تورکی بەڵێنی بەخشینی مافە نەتەوەییەکانی بەکورد دا هەروەك بەڵێنی دیاریکردنی سنوری دا لە نێوان ئەو ناوچانەی کە تورکیان تێدا نیشتەجێیەو ئەو ناوچانەی کە کوردی لێ دەژی ئەوەش لە چوارچێوەی یەکێتی و هاریکاریدا، بەو پێیەش ئەم شەڕەش شەڕێکی هاوبەشە کە تورك و کورد شان بەشان دەیکەن. بەلام کاتێ تورکەکان توانیان کۆماری تورکیا دابمەزرێنن نکوڵی تەنانەت بوونی کوردیان کرد.

مێژووی جیهان لەو ڕووداو و بەسەرهاتە تۆمارکراوانە پێکنایەت کە لە کتێبدا تۆماردەکرێن، بەڵکو زۆر ڕووداوهەن کە بەڕاستی ڕوویان داوە بەلام لە کتێب دا تۆمار نەکراون، لەبەر ئەوە نەبوونەتە جێگای بایەخ پێدانی ئەو کەس و توێژەرانەی کە لێکۆڵینەوەی مێژوو دەکەن. مەسەلەی دەرخستنی ڕووداوە پەرتەکان و پێدانی بەهایەکی گەورەپێیان و دانانیان لە پێشەوەی هەموو ڕووداوەکان و شاردنەوەی ڕووداوی ترو داپۆشینی سیماکانیان مەسەلەیەکە پەیوەستە بە کاریگەری ئایدۆلۆژییەکانەوە بەگشتی و ئایدۆلۆژیای ڕەسمی دەوڵەت بەشێوەیەکی تایبەتی. ئەوەش کارێکە دژی زانستە.

ئێمە ئاگاداری ئەو تاوانانەین کە هیتلەر دژی جولەکە ئەنجامی‌دا، چونکە تۆمارکراون و وەکو بەڵگەنامە ڕێکخراون؛ لە دادگاییەکانیشدا بڕیاری تاوانبارکردن دەرچووەو تاوانبارکراوان و شایەت و پارێزەران و بڕیارەکانی دادوەری ئامادەن و بەیارمەتی هەموو ئەمانە توانای ڕێکخستنی ڕووداوەکان هەبووە بەلام قەسابخانەو کاری قەلاچۆکردن کەبەدژی کوردەکان کراون تۆمار نەکراون. هەروەك ئیحتمالی زۆر هەیە کە دۆکیومێنتە ڕەسمیەکانی پەیوەندیدار بەم ڕووداوانە لەناوبرابن یان سەرنگوم کرابن یان لە شوێنی وەهادا دانرابن بۆ توێژەران زەحمەت بێت دەستیان پێیان بگات.

بەلام سەرباری ترساندن و سەرکوت کردن، توانراوە ڕووداوی هەڵەبجە کە لە ناوەڕاستی ئازاری 1988 دا ڕوویدا تۆمار بکرێت. لەبەر ئەمە ئەم ڕوداوانە چوونەتە ناو مێژووەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ناشێت ئەو ڕووداوانە پشت گوێ بخرێن کە پەیوەندییان بە قەسابخانەی هەڵەبجەوە هەیە. لە ساڵی 1989دا حکومەتی فەرەنسا کۆنگرەیەکی ڕێکخست بۆ قەدەغەکردنی چەکی کیمیاوی و تێکشاندنی ئەو چەکانە بەشێوەیەکی بەدوای یەکدا هاتوو. کوردەکان داوای بەشدارییان لەو کۆنگرەیەدا کرد لەبەر ئەوەی کە ئەمان ئەو نەتەوەن کە زیاتر لە جارێك بوونەتە ئامانج بەشێوەیەکی بەرفراوانیش بوونەتە ئامانجی چەکی کیمیاوی.

بەلام ئەو دەوڵەتانەی کە زیاترین جار ئەم چەکەیان دژی کوردەکان بەکارهێناوەو تاوانی قەلاچۆکردنیان بەدژیان ئەنجام داوە بەتوندی دژی بەشداری نوێنەری کوردەکان وەستان. کۆنگرەکەش ئارەزووی ئەو دەوڵەتانەی ڕەچاوکردو نوێنەری قوربانیانی قەلاچۆکراو بەچەکی کیمیاوی دورخستەوە. هەر ئەم ڕووداوە بە تەنیا بەڵگایەکی ترسناك دەری دەخات کە حاڵی مافەکانی مرۆڤ و گەلان چەند لەبەردەم هەڕەشەو مەترسیدایە.

لە حاڵەتێکی لەم جۆرەدا پێویستە لەسەر کوردەکان تواناکانی خۆیان لەسەر نیشاندانی ڕوداوە مێژووییەکان لە ڕوانگەی ئیتنیکیەوە گەشە پێ بدەن. ئەمەش ئەو شتەیە کە لە ڕاستیدا تورکەکان و هەروەها مارکسیە تورکەکانیش ئەنجامی دەدەن. مارکسیە تورکەکان لەم کات بۆ ئەو کات دەڵێن ئەرکی زۆریان لە پێشە واپێویستە ئەنجامی بدەن و کاتی تەواویشیان نی‌یە بۆ بایەخدان بە بابەتە تایبەتی‌یەکان. ئەم جۆرە ڕاگەیاندنە ڕوویەکی شێوازی لەوبیرکردنەوەیان نیشان دەدات کە لە سەرەوە باسمان کرد.

نموونەیەکی تر هەیە ئەویش جەنابی (شەفیق حسنو) یە کە لە ماوەی جەنگی دووەمی جیهانیدا چووە ریزی سوپاوەو لەدەوری خۆیدا بوو بە پیاوێکی گرنگ لە ناو تورکیادا. چەپی تورکی و هەروەها مارکسیەکانیش پشتیان بە شەفیق حەسنۆ دەبەستن و بەسەرۆکی دادەنێن، بەلام ئەم پیاوە بە گوێرەی کوردەکان جگە لە دوژمنێك لەنێو دەیان هەزار دوژمنی تردا هیچی ترنەبووە، لەکاتی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکانی کورددا هەمیشە لایەنگری کەمالیەکان بوو، بەردەوامیش پشتگیری قەسابخانەو کاری قەلاچۆکردنی بەدژی کوردەکان دەکردو ئەوەشی بەکار ئەنجامدانی پێشکەوتنخوازانەو شۆڕشگێڕانە ناو دەبرد. ئایا شتێکی لەوە ناکۆك تر هەیە کە چەپی تورکی داوا لە کوردەکان بکات کە دان بنێن بە شەفیق حسنۆدا وەکو سەرکردەیەکی مێژوویی؟

هەروەك ئەو گفتوگۆیانەی کە لە نێوان هەردوو گۆڤاری Medya Gunesi و Ozgur Gelecek ڕوویدا بوونە جێی بایەخ کە بەدەست پێشکەری یەکەمیان دوای بڵاوبوونەوەی بانگەوازێك بەموناسەبەی یادی سێ‌هەمین ساڵەی مردنی شەفیق حسنۆ دیمیرەوە لە 1989/2/3دا لەلایەن دووەمیانەوە.

سنیان دۆگرۆ لە گۆڤاری یەکەمدا نووسی شەفیق حسنۆ بوو بە دوژمنێکی ئاشکرای کوردەکان و بەکرێ گیراوێکی بۆرژوازیەت، لەبەرئەوە کوردەکان بەشداری ناکەن لە ئاهەنگی ڕێکخراو بەم موناسەبەتەوە. (میدیا گۆنیسی ژمارە (10) ساڵی 1989).

پەیمانی لۆزان بە دکیومێنتێکی مێژوویی دادەنرێت و لەبەر ئەمەش ناوەڕۆکێکی تەواو جیاوازی هەیە بەگوێرەی هەرەیەکە لە کوردو تورکەکان.

شێخ عوبەیدوڵای نەهری و (عەلی شێر) و شێخ سەعیدو ئیحسان نوری و سمکۆو سەید ڕەزای دەرسیم و قازی محەمەدو مەلا مستەفای بەرزانی و زۆری تریش جگە لەمانە بە گوێرەی کوردەکان لە نیشتیمانپەروەرە پایە بەرزەکان بوون. کەچی تورك و چەپی تورکی هەوڵدەدەن لەناوو ناوبانگیان کەم بکەنەوەو بەناوبردنیان بە کۆنەپەرست و بەکرێگیراوی ئینگلیزو دزو ڕێگرو تاد لە پلەو پایەیان بهێننە خوارەوە.

و: سکرتێری ڕۆڤار

سەرچاوە:

کوردستان مستعمرە دولیە ص 194–201



# داینامیکی جەماوەری
# ل جوڵانەوەی نیشتمانیدا

جڤانی کوردستان لەم ساڵانەی دواییدا ڕووبەڕووی گەلێک دژواری دەبێتەوە، ئەمەش ڕۆژبەڕۆژ گرانتر دەبێ لەسەری. بە قوڵبوونەوەو فرەبوونی تێکۆشانی ڕزگاری نیشتمانی و کۆمەڵایەتی پێکەوە گرێدانی جەماوەری کورد بە ڕەنگێکی وا دەبێتە مایەی هەراسانی بەڕێوەبەرانی داگیرکەرو ڕەگەزپەرستان. شاڵاوی پەلاماردانی فەرماندە داگیرکەرە ڕەگەزپەرستەکان زیاتر لە هێزی کۆمەڵانی جەماوەری کوردستان دەگرێتەوە

سوتاندن و وێرانکردنی گوندەکان و تێکوپێکدانی شتومەکی ناوماڵ و کوشتنی ئاژەڵەکانیان و تەلەفکردنی خواردن و کالایان، ئەمانە هەمووی لەم چوارچێوەیەدا ڕوودەدەن، لەسەر هەر کەسێک دەسەپێندرێت کە گوندەکان چۆڵ بکەن یان ببنە جاش بەم پێیە هەم دەیانەوێت ڕێگە لە جەماوەر بگرن و هەم لەو ناوچانەی کە میللەت دەبنە پاڵپشتێک بۆ هێزی ڕاپەڕیوو بەربەست دروستبکەن لە گەیاندنی یارمەتی بۆ هێزی بەرگری. سێیەم سزادانێکی توندی جەماوەرە کە وەک گۆشت و نیسک لەگەڵ هێزی بەرگریدا بوونەتە یەک. ئەم سزادانەی داگیرکەر لەسەر خەڵکی کۆلۆنی کراو بە ڕێگای دەزگای داپڵۆسینەرو دادگاکانەوە تا دەچێت توندتر دەبێت چونکە ئەم سزادانە زیاتر لەوەی تاکە تاکەی ڕێکخراوەکان بگرێتەوە بە پلەی یەکەم بەسەر جەماوەردا دەشکێتەوە.

چوونی خەڵکی بۆ کوێستانەکان قەدەغە دەکەن، پشکنینی پەیتاپەیتای هێزەکانی ئاسایش و سوتاندنی سەرتاپای گوندو وێرانکردن و ڕاگواستنی تاد. ئاشکرایە کە ئەم ڕەفتارانە ژیانی خەڵکی کورد دەکاتە دۆزەخ و کوردەکان لەبەرئەوەی تا ئێستا چارەنووسیان دیارینەکراوە ئازارێکی زۆر دەچێژن. وڵاتەکەیان دابەشکراو و پارچە پارچەکراوە، کوردستان لەژێر زەبروزەنگی داگیرکەرانی نێودەوڵەتیدایەو ئەو دەوڵەتانەی هاوکارن بۆ ئەوەی کوردستان لەژێر چەپۆکیاندا بهێڵنەوە. هەرچی سامانی سروشتی بەهاداری کوردستان هەیە دەیبەن و لە بەرامبەردا زیندان و سەربازگەو دارو قۆنداخە تفەنگ و شەق و ئەشکەنجە دەکەنە دیاری. هیچ پێویستییەکی دابینکردنی ژیان کە بایی فلسێکیش بێت نەدراوە بە خەڵکی کوردستان

ئەو بودجەیەی تایبەتە بە ڕۆژهەڵات و باشوری ڕۆژهەڵات تەنها لە پێناوی دامرکاندنەوەو هێشتنەوەی خەڵکی کورد بە کۆلۆنیکراویی و بەهێزکردنی میکانیزمی ئەو کارەیەو بەس. خەرجی تیپی تایبەت، فڕۆکەو هێلیکۆپتەری جەنگی ئامرازە کوشندەکانی وەک تۆپ و تانک و زرێپۆش و هاوەندو تاد، هەر جۆرە تەکنیکێکی شەڕ. تەل دڕکاوی. مین.. تاد. گرتوخانە. مەخفەری پۆلیس، لۆژماتی ئاسایش، موچەی دووقات بۆ فەرمانبەرانی ناوچەی دۆخی خێراو (طوارىء) موچەی جاشان، سەرجەم ئەم خەرجیانەی دەوڵەت لە کوردستان دەیکات لەم بوارانەدا

هەموو ڕێگا بۆ تانک و بۆ سەربازە، ئامانجی فێرگەکان بۆ توانەوەی گەلی کوردە، کوردستان هەر بە ئەنقەست بە دواکەوتوویی دەیهێڵنەوە

ئەم بەدواکەوتوو هێشتنەوەی کوردستانیش بە تایبەتی بۆ ئەوەیە هەرچی زیاترو هاسانتر سامانی زەنگینی پترۆڵ و ئاوی کوردستان تالان و کۆلۆنی بکەن.

بروبیانووی هۆکاری جوگرافی لە دواکەوتوومانەوەی کوردستان، بەگوێی کەسدا ناچێت، نیتر ناهێڵن کوردەکان لە گوندو هەوارو خانووەکانیان ئارام بسرەون، پەلامارو پشکنینی یەک لە دوای یەکی هێزەکانی دەوڵەت بۆ سەر لادێکان و ڕووبەڕووبوونەوەی خەڵکی بۆ ئەو داسەپاندنەی دەوڵەت: "یا چۆڵی کەن یا ببنە جاش"، ڕێگرتن لە گیادروون بۆ ئاژەڵەکان و چوون بۆ کوێستانان، زوو زوو تەگەرەخستنە هەر کارێکی کۆچەری ئۆزانەکان گەیشتۆتە ڕەوشێک کە پیشەی ئاژەڵداری بەرەو نەمان دەبات. لە ئەنجامی لەشکرکێشی بەردەوام کشتوکاڵیش هەر بەو دەردە براوەو بەرهەم هێجگار کەم



بووه. ئەوەندەش کە بەرهەم دێ لەگەڵ وێرانکردن و سووتاندنی لادێکاندا دەڤەوتێ. ئێش و ئازاری کوردەکان لەوەدایە کە ناتوانن بە دەستی خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاریبکەن.

سەرەڕای هەموو ئەوانەی باسکران، کوردەکان بە چاو 15–20 ساڵ لەمەوبەریانەوە، هەنووکە کە لە ئاستێکی زۆر بەرزتردا دەژین. ئیدی زانستی ئازادبوون چۆتە ناخی هەر مرۆڤێکی کوردەوە. هەزاران شەهید دراوەو خەڵکی کوردستانیش خاوەندارێتی لەو شەهیدانە دەکەن، شەهیدانی خەباتی ڕزگاری کۆمەڵایەتی و نیشتمانی لە مێشکی خەڵکی کوردا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ جێگایەکی گرنگتر دەگرێت. ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی دەسگیر دەکرێن و دەچنە زیندان و دێنە دەرەوە.

کەسوکاری ئەوانەی دەخاخرێنە زیندان وەك دایك و باوك و خوشك و برا کە دێنە بەردەرگای زیندان و شوێنی یەکتربینین زاناو سیاسی دەبن.

بەدەست حکومەتەوەیە لەم چەند کاتەی دواییدا هێرشێکی تر بکاتە سەر زیندانییەکان، لە بەرامبەر دیلەکان (جەنگاوەرو شۆڕشگێرانی دیل کراو) نەخشەی پەلاماردانی گەورە لە ئارادایە. حکومەت تەقەلای زۆر وەگەڕدەخات بۆ زەوتکردنی مافە بەدەستهاتووەکانی گیراوەکان. بەندکراوەکانیش لە زیندانی جیاواز مانگرتنیان لە خواردن سازکردووە بۆ پرۆتیستۆکردنی ئەو ئۆپەراسیۆنانە، لەگەڵێك شوێنیش بۆ پاڵپشتی کردنیان، خێزان و کەسوکاریان لە دەرەوەی زیندان دەستیان بە مانگرتن کردووە.

لە بەندیخانەی دیاربەکر زیندانییەکان هەر لە ناوەڕاستی مانگی نیسانەوە دەستیان بە مانگرتن کردووە، کەسوکاری بەندکراوان لە دەرەوەی زیندان بە مانگرتن پشتگیری خۆیان بۆ مانگرتوانی ناو زیندان بەرپێکردووە، بەشێك لە کەسوکاری بەندکراوان کە نزیکەی (30) کەسێکن لە ڕۆژانی 5–8ی ئاياری 1993 بەدواوە لە بەردەم بینایەی ناوەندی (HEP) لە ئەنکەرە مانیانگرتووەو ئەو چالاکیەش سەرکەوتووانە کۆتاییهات. لە ناویاندا ژن و پیاوی بەساڵاچووش بەرچاودەکەوتن، زۆربەیان ئافرەت بوون. ژمارەیەکی زۆر خەڵك دەهاتنە سەردانی مانگرتووان، دەمەوێ لەسەر ئەو مانگرتووانە هەندێك چاودیتی خۆم باسبکەم

لە ڕاگەیاندن و زانکۆکان دەمەدەم دانوسانێك دەکرا کە ئایا کوردەکان نەتەوەن، یان نەتەوە نین. بەر لە هەموو شتێك نەتەوە بریتییە لە دروستبوونی هۆشیاری، تێکۆشانی جڤاکی و نەتەوەیی بنەمای ڕێکخستنی عەشیرەتگەری بە ڕادەیەکی بەرز هەڵوەشاندووە. ئیتر کەس باسی ئەوە ناکات کە سەر بە چ خێڵ و کام هۆزن، هەموو پێ لەسەر کوردبوون دادەگرن، سەرەتا باس لەوە دەکرێت کە مافە نەتەوەیی و دیموکراتییەکانی کورد زەوتکراوەو دەبێ سەرلەنوێ کارو خەبات بۆ گەڕانەوەی ئەو مافانە بکرێ، ئەوەی ئەم خەباتە دەیداتە ڤامکردن ئەوەیە.

لە شارەکانی دیاربەکرو ماردین و ئورفەو سێرت و وان و باتمان و بەدلیس و زۆر شوێنی تر، ئەو کەسانەی تەفلی مانگرتن دەبن، ژن و پیاویان باسی ئەوە دەکەن کە خەڵکی وڵاتی کوردانن و خاوەن وڵاتێکن و پێ لەسەر ئەوە دادەگرن کە وڵاتەکەیان پارچە پارچەو دابەشکراوە.

خەڵکی کورد لەهەر دەڤەرێکی کوردستان ئەو زوڵم و ستەمەی بینیویانە لە هەڵسوکەوت و جوڵانەوەیاندا ڕەنگدەداتەوە.

سەرجەم پەیوەندی ئۆرگانی نێوان کوردان و یەکێتی هاوخەباتیان زیاتر بەهێز دەکات.

ئەو ئاخافتن و جموجوڵ و هەڵوێستانەی بەشدارانی مانگرتن وەك ئاوێنە هەر لایەنێکی نەتەوایەتیان دەخاتە بەرچاو، ئەوانەی دێنە سەردانی مانگرتووان جاربەجار شایی دەکەن، شانۆ سازدەکەن، هەلهەلەو مۆسیقاو گۆرانی دەچڕن، سەردولکەو لۆرین و لاوانەوەیانە، پڕاوپڕ دلۆڤانی نیشتمانی دەجوڵێنن و دەیهێننە سەماو جۆش و خرۆش، گۆرانی ڕەنگاوڕەنگی فۆلکلۆری، مەردایەتی و قارەمانێتی جڤاکی و نەتەوایەتی دێننە سەرزمان. لەسەر بنچینەی پیرۆزی وڵات و نەتەوە دەچمێن.

وەرچەرخانی سیاسی و جڤاکی لە کوردستان بەردەوامە. لە (7) ساڵییەوە تا (70) ساڵی خەڵکی کورد هەڵساوەتەوە سەرپێ، ئەو خەڵکەی لەناوبرابوو، ناوی گوم ببوو، توابۆوە، لەناو قەبرستانی بە چیمەنتۆ داپۆشراو ناخنرابوو، دیسانەوە هەڵساوەتە سەرپێ.

ئافرەتان لەناو سیاسەتدان، ئەمە هەڵسانەوەیەکی هێجگار مەزنە. سەخت و دژوارە بەڵام داهاتوویەکی تا بڵێی ڕووناکی هەیە.. لەژێر زەبروزەنگ و ئەشکەنجەی بەردەوامدا، کە سیاسەتێکی سیستەماتیکی دەوڵەت پیادە دەکرێ.. ڕابوونێکی ئەوەندە هێژاو گەورە.

خەڵکێك ببێتە خاوەن زانستێکی تێکۆشان لە پێناوی ئازادی و یەکسانی بەو جۆرە. زاڵبوون بەسەریدا مەحاڵە. بێ هیچ دوو دڵییەك خەڵکی کورد دەگەنە پێناسەی خۆیان و خاوەندارێتی لە وڵاتی خۆیان دەکەن.

لە پێناوی پێناسەی کوردو ناسنامەی کوردستاندا هەزاران کەس شەهیدبوون کاتێك کوردەکان هێجگار سوورن لەسەر خاوەندارێتی کردنی شەهیدان و ئەمەش دەکەنە داموەزگایەکی پیرۆز ئەوکات هەستدەکەن کە مەعنەویاتیان زۆر بەرز دەکاتەوە.

خاوەندارێتی کردنی شەهیدان مانای خاوەندارێتی کردنی نەتەوەو وڵاتە.



سەرچاوە:

ئەم نوسراوە لە ڕۆژنامەی "ئۆزگور گوندەم" چاپکراوی 14ی ئاياری 1993 بە زمانی تورکی بڵاوکراوەتەوە.

وڵات

# (پ گ ك) و چاڵدێران (ئۆزالپ) 1930، چاڵدێران 1943، چاڵدێران 1976

ئەو هەڵوێستانەی زانكۆی توركی، (چەپ)ی توركی و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی توركی كە هێڵە گشتییەكانیان ڕوونكرایەوە، جۆرنەتێكی گەورەیان بە (پ گ ك) و سەرۆكەكەی (بلند ئەجەویت) بەخشیوەو دەبەخشن. بلند ئەجەویت لە كاتێكدا كە زەق زەق سەیری چاوی چەپڕەوە توركەكان و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی توركی دەكات، بوونی نەتەوەیی نەتەوەی كورد ڕەتدەكاتەوەو نكۆڵی لێدەكات. بلند ئەجەویت كە زوو زوو باسی ئازادی، دیموكراسی، بەهاو ڕێزو شەرەفی مرۆڤ و نرخە مادی و مەعنەوییەكانی دەكات و، ئەم چەمكانە لە زمانی ناكەونە خوارەوە، چۆن دەتوانن هەڵوێستی ڕەگەزپەرست و كۆڵۆنیال و ئیمپریالیستانەی خۆی، ئەوەندە بە ئاسوودەیی ڕابگەیەنێ؟ (پ گ ك) و سەرۆكەكەی (بلند ئەجەویت) كە دەڵێن ئێمە چەپی دیموكراتین و ڕای دەگەیەنن كە ئەمە باشترین جۆری ڕژێمی (چەپ)ە، لەبەرچی ڕەتكردنەوەی بوونی نەتەوەی كوردو كردەوەی زەوتكردنی مافە نەتەوەیی و دیموكراتی و ئازادیەكانی نەتەوەی كورد بە ڕەوا دەبینن و خۆیان دەكەنە خاوەنی؟

بێگومان بونیادی (پ گ ك) و كەسێتی ڕەگەزپەرست و دژە دیموكراتی (بلند ئەجەویت)، ڕۆڵی خۆیان هەیە لەم پرۆسەیەدا، بەڵام هۆیەكی گرنگی تریش، بێدەنگی "چەپ"ی توركی و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی توركییە (پ گ ك) و بلند ئەجەویت دەزانن "چەپ"ی تورك و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی توركی كە كاریگەرترین ڕای گشتین لە توركیادا، لەم مەسەلەیەدا ڕەخنەیان لێناگرن. پەردە لەسەر ڕوویان هەڵناماڵن. چاو لە هەڵوێستی ڕەگەزپەرست و كۆڵۆنیالیستیان دەخەفێنن. هەرچی ڕەخنەی داهاتووی كوردەكانیشە، هەر لە بنەڕەتدا والی و قایمقام و فەرماندەكانی جەندرمە شەڕیان لەگەڵ دەكەن. بەم جۆرە لە كاتێكدا كە لە پرۆگرامە نوێكەی (پ گ ك)دا، بوونی نەتەوەیی نەتەوەی كورد بە تەواوەتی ڕەتكراوەتەوە، واتە لە كاتێكدا كە سیاسەتێكی كۆڵۆنیال و ئیلحاقچی و ڕەگەزپەرست و توركێنەر بەوپەڕی فراوانی و چڕی درێژەی پێدەدرێ، دەشگوترێ (پ گ ك) دژی كۆڵۆنیالیزمە. حیزبێك كە دانی بە بوونی نەتەوەیی نەتەوەی كورددا نەناوەو خاوەن و پشتیوانی هەموو كارێكە كە دژی نەتەوەی كوردو كوردستان ئەنجامبدرێ، چۆن دەتوانێ بڵێ دژی ئیمپریالیزمە؟ بێگومان دەبێ ئەم بێپەروایی‌و درۆیەی (پ گ ك) و بلند ئەجەویت بە بەرچاوی هەمووانەوە دەیكەن، پەردەیان لەسەر هەڵماڵرێ. بەڵام وەكو لە بەشی پێشوودا باسمانكرد، هیچ حیزبێكی (سۆسیالیست) ئەم ئەركەی ئەنجامنەداوە.

لەم ڕووەوە (بلند ئەجەویت) لە سەردانەكانیدا بۆ وڵاتانی جیاجیا، چ وەك سەرۆكی گشتی (پ گ ك) و چ وەك سەرەك وەزیریش، دەتوانێ بە ئیسراحەت باسی ئەم ساختەچێتییەی خۆی بكات. دەتوانین ئەم هەڵوێستە لەم بەیاننامە هاوبەشانەدا ببینین كە لە كۆتایی سەردانەكانیدا بۆ وڵاتانی وەك ئەمریكا، بەریتانیا، بەلجیكاو هەروەها بۆ وڵاتانی وەك یەكێتی سۆڤیەت، بولگاریا و یۆگۆسلاڤیا، ئامادەكراون. بۆ نموونە لەو بەیاننامە هاوبەشەدا كە لە كۆتایی سەردانێكدا بۆ یەكێتی سۆڤیەت لە نێوان 22-25ی حوزەیرانی 1978دا، بڵاوكراوەتەوە، ئاوا دەگوترێ: "هەردوولا ڕایانگەیاندووە پشتیوانی لەو هەوڵ و تەقەللایانە دەكەن، كە بۆ لەناوبردنی تەواوەتی هەموو جۆرە ڕەگەزپەرستی و كۆڵۆنیالیزمێك دەدرێن". (میللەت، 1978/6/26).

توانای باسكردنی ئەم ساختەچێتییە بە ئیسراحەت، سەرەڕای سیاسەتی ڕەگەزپەرستانە بەرامبەر كوردو كۆڵۆنیالیزم لەسەر كوردستان، دەگەڕێتەوە بۆ ئاسوودەیی بەرامبەر "دیموكرات"ە توركەكان و "چەپ"ی توركی. لە لایەكی ترەوە هەڵوێستی یەكێتی سۆڤیەتیش گرنگە ئایا دەگونجێ یەكێتی سۆڤێت نەزانێ كە لە (1922)وە تا ئەمڕۆ، هەموو دەسەڵاتدارە سیاسییەكانی توركیا پەیڕەوییان لە سیاسەتێكی ڕەگەزپەرستانە كردووە بەرامبەر نەتەوەی كوردو مافە نەتەوەیی ودیموكراتیەكانی كوردیان زەوتكردووە؟ خۆهەڵەكردن لەم سیفەتانەی حكومەتێكی ڕەگەزپەرست‌و كۆڵۆنیالیزم"، لە گەڵیاندا، بێجگە لە هاندانیان بۆ بەردەوام بوون لەسەر هەڵوێستەكانی خۆیان، هیچی تر نییە"[1]

هەڵوێستی (پ گ ك) و بلند ئەجەویتی بەڕێوەبەری، لەگەڵ هەڵوێستی بەعسیە ڕەگەزپەرستە كۆڵۆنیالییەكاندا، بچووكترین جیاوازی نییە. بەعسیە ڕەگەزپەرست و كۆڵۆنیالییەكان لە كاتێكدا نەتەوەی كوردیان خەڵتانی خوێن دەكرد، كوردیان لە كوردساتەنەوە بۆ ناوچە بیابانیەكان ڕادەگواست و بەزۆرەملێ نیشتەجێیان دەكردن، منداڵانی كوردیان بە كۆمەڵ دەكوشت، دارستانەكانی كوردستانیان دەسوتان، ئاوەكانیان ژەهراوی دەكردو خاوەنی هەزارو یەك جۆرە كردەوەی ڕەگەزپەرستانە بوون. لە بەغدا سیمینارێكی نێودەوڵەتیان لەسەر مەسەلەی "ڕەگەزپەرستی و زایۆنیزم" سازدەدا. چییە مەسەلە؟ خاكە عەرەبییەكانی ژێر دەستی ئیسرائیل. باشە ئەی لە مەسەلەی خاكە كوردیە داگیركراوەكانی ژێردەستی عەرەبدا دەبێ چی بگوترێ؟ تا بونیادێكی تەندروستی فكری و كردەگی لە مەسەلەی خاكە كوردییە داگیركراوەكانی ژێردەستی عەرەب و ژێردەستی فارس و ژێردەستی توركدا بەدەست نەهێنرێ. ئایا دەتوانرێ فكرو كردارێكی هاوسەنگ و گونجاو لەسەر مەسەلەی خاكە عەرەبییەكانی ژێردەستی ئیسرائیل بەرهەمبهێنرێ؟ لەو سیمینارەدا، ڕەگەزپەرستی و زایۆنیزم وەكو گەورەترین مەترسی نێودەوڵەتی پێشكەش دەكران. بە ڕاگەیاندنی ئەوەی كە "هیچ شتێك لە ڕەگەزپەرستی خراپتر نییە". هەوڵی شاردنەوەی ئەو كارە ڕەگەزپەرست و كۆڵۆنیالییانە ئەدرا كە بەعسیە ڕەگەزپەرست و كۆڵۆنیالییەكان دژی كورد پەیڕەوی لێدەكەن. ئەم ساختەچێتییەی بەعسیەكان. لە لایەن هەموو چاپەمەنی توركییەوە، لە سەرووی هەمووشیانەوە ڕۆژنامەی (یەنی ئولولس Yeni Ulus)، وا پێشكەشدەكرا كە گوایە "بەڕێوەبەرانی بەعس دژی ڕەگەزپەرستی خەبات دەكەن"[2]

پێویستە "چەپ"ی تورك و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی توركی زۆر بە چاكی لەم دوو خاڵە تێبگەن: تا سیاسەتی كۆڵۆنیالی لەسەر كوردستان بەردەوام بێت، سیفەتی دەسەڵات لە توركیادا هەمیشە سەركوتكەرو ملهوڕ دەبێت. هیچ جیاوازییەكیش لە نێوان سەرەك وەزیرێتی (سلیمان دەمیرل) و سەرەك وەزیرێتی (بلند ئەجەویت)دا نابێت لەگەڵ پەرەسەندن و

24

بەدەستهێنانی ڕەهەندی نوێی بزوتنەوەی نەتەوەیی دیموکراتی کورددا سیفەتی فاشیستی ئەم دەسەڵاتە دیارترو ئاشکراتریش دەبێت. دووەمیش ئەوەیە، نابێ ئەوەش لەبیر بکرێ کە کوردستان چیتر کوردستانەکەی جاران نیە. خەباتی نەتەوەیی دیموکراتی کورد، واتە خەباتی دژی کۆلۆنیالیزم بە چڕی و فراوانی بەردەوامەو، ئەو کارو چالاکییانەی کە نەتەوەی کورد بۆ بە دەستهێنانەوەی مافە دیموکراتی و ئازادییەکانی درێژەیان پێدەدات، ڕۆژ بە ڕۆژ پەرەدەستێنن و بەرفراوان دەبن

لەم بارودۆخەدا پێویستە لەسەر "چەپ"ی تورک و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی تورکی، پەردە لەسەر ڕووی (پ گ ک) و سەرۆکەکەی هەڵماڵن. کە وشەگەل وەك دیموکراسی، یەکسانی، ئازادی و چەپی دیموکرات-یان لە سەردەم ناکەوێتە خوارەوەو بە بڕیاری بەشداریکردن لە ئەنتەرناسیونالی سۆسیالیستیدا ئەیانەوێ وشەی "سۆسیالیزم" بە قازانجی خۆیان بەکاربێنن. دەبێ لەو سەرکردەیەی بگەیەنن کە ئەو هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتیە نوێیانەی خەریکن لە تورکیا پەرەدەستێنن، ڕێگە نادەن هیچ کەسێك ببێتە (فرانکۆ). هێنانەوەی شیکردنەوەی وەك "پرۆگرامە نوێکەی (پ گ ک) ئازادی فیکری بێ سنوور دێنێ. دیموکراسی بەرفراوان و گەورە دەکا"، لە لایەن (چەپ)ی تورك و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی تورکیەوە. لە کاتێکدا کە سەرۆکی (پ گ ك) بلند نەجەوێت بەسوور بوونێکی گەورەوە ڕایدەگەیەنێ ئەوانەی بیر لە مەسەلەی کورد دەکەنەوەو لە سەری دەنووسن و ئەوانەش کە لێکۆڵینەوە لەسەر بونیادی ئابووری- کۆمەڵایەتی کوردستان دەکەن، لە چوارچێوەی ئازادی بیروڕادا هەڵیانناسەنگێنێ و بیرکردنەوەی لەو جۆرە بە تاوان و خاوەنەکەیشی بە تاوانبار دەزانێت. هێنانەوەی شیکردنەوەی وەك "پرۆگرامە نوێیەکەی (پ گ ك) ئازادی فکری بێ سنوور دێنێ. دیموکراسی بەرفراوان و گەورە دەکا"، لە لایەن "چەپ"ی تورك و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی تورکییەوە، هەڵوێستێکی بێئەندازە هەڵەیە پێویستە لەسەر "چەپ"ی تورك و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی تورکی، ڕەخنە لە (پ گ ك) بگرن لە مەسەلەی کێشەی نەتەوەی کوردیشدا

گرنگترین تایبەتمەندی فکری زانستی بریتییە لە تاووتوێکردنی فاکتەکان لەناو ئەو یەکێتی و یەکپارچەییەدا کە پێکەوە پێکیدەهێنن، نەك بە جیاجیاو سەربەخۆ، واتە نەك وەك "شتێك" یاخود چەند "شتێك" هەروەها فکری زانستی هەوڵدەدات ئەم یەکێتی فاکتانە لەناو هەردوو ڕەهەندی کات و شوێندا پێکبێنێ، بەم شێوەیە وەك چۆن کاریگەری فاکتەکانی تر لەسەر هەر یەکێك لەو فاکتانە بە ڕوونی دەردەکەوێ، ئاواش کاریگەری ئەم لەسەر ئەوانی تر ئاشکرا دەبێ. بەم جۆرە فاکتەکان لەناو یەکپارچەیی خۆیاندا بە پەیوەندییە ناوەکی و دەرەکیاکانیانەوە، بە دینامیکە ناوەکی و دەرەکیەکانیانەوە، بە دژایەتی و گۆڕانکارییەکانیانەوە تاووتوێ دەکرێن زانیارییەکی کۆنکرێتی سەبارەت بە پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی بەدەستدێت.

ئێمە لێرەدا باسی چەند فاکتێکی پەیوەست بە ساڵانی 1930، 1943، 1945، 1973، 1974، 1976 دەکەین و لە پەیوەندی نێوانیان دەدوێین.

1-یەکێك لەم فاکتانە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1930 و پەیوەستە بە بیرەوەرییەکانی (دریڤان بەی ئۆغلو خەسرەو گەرەدە)وە کە لە مانگی ئەیلولی ساڵی 1930دا کراوە بە گەورە باڵیۆزی تورکیا لە ئێران و لە نێوان ساڵانی 1930-1934دا لەسەر ئەم کارە بەردەوامبووە. کاتێك کە باسی (سی و سێ گوللە)مان دەکرد، بە دوورو درێژی لەسەر ئەم فاکتە ڕاوەستاین. وەك خوێنەران لە بیریانە، گەورە باڵیۆز، کوردی بە دوژمنی هاوبەشی ئێران و تورکیاو ئینگلتەرەو فەرەنسا ناودەبردو داوای لە شاهەنشا "ڕەزا شا پەهلەوی" دەکرد. بە هێزو توانایەکی فراوانەوە بەشداری کاری سیاسی و



عەسکەری و ئایدیۆلۆجی بکات بۆ تێکوپێك شکاندنی ئەم دوژمنە هاوبەشە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو نەتەوەی کورد بە دوژمن دانراوە، بەڵام بێگومان ئەم "دوژمنایەتی"یە، پتر لەسەر کوردەکانی دانیشتووی سنوورو لەناو ئەمانیشدا خەڵکی ناحیەی (چاڵدێران)ی سەر بە (ئۆزاڵپ)، کاریگەر دەبێ"[1].

با ئەوەش بڵێین کە (خەسرەو گەرەدە) لە ساڵی 1919 بەدواوە یەکێك بووە لە ئەندامانی بارەگای مستەفا کەمال و کاروباری سیاسی ناوبراوی بەڕێوە بردووەو یەکێك بووە لە نزیکترین پیاوەکانی (شەوکەت سورەییا ئایدەمیر، تاکە کەس، بەرگی2، ئەستەمووڵ 1946، ل 24). دیسان بە سوود دەبێ ڕایبگەیەنین کە خەسرەو گەرەدە لە ساڵانی جەنگی جیهانی دووەمدا، بە گەرمی پشتیوانی لە (هتلەر) کردووە. لەو سەردەمەدا کە لە بەرلین گەورە باڵیۆز بووە، لە 5ی ئابی 1941دا چۆتە وەزارەتی دەرەوەی ئەڵمانیاو پێشنیاری کردووە چەرکەس و تورکەکانی ڕوسیا لە پڕوپاگەندە کردن دژی یەکێتی سۆڤێتدا بەکاربهێنرێن. ڕایشیگەیاندووە کە لە پێناوی بڵاوبوونەوەی (نازیسم) بە ڕووسیادا، ئامادەیە خۆیشی بکەوێتەکار (دۆغان ئاڵجی ئۆغلو، مێژووی ڕزگاری نەتەوەیی، بەرگی3، ئەستەمووڵ 1974، ل 1519—1920).

لەو سەردەمەدا کەسانی وەك فەرماندەی سوپا سەرلەشکر (عەلی فوئاد ئەردەن)، نووسەرو جەنەراڵی خانەنشین (حسەین حوسنی ئەرکیلەت)، گەورە باڵیۆزی بەرلین (خەسرەو گەرەدە)، فەرماندەی ئەرکانی گشتی (مارشال فەوزی چەکماك) کە دەسەڵاتی دابوو بە د. گراون)ی سیخوڕی ئەڵمانیا بە نوێنەرایەتی خۆی گفتوگۆ لەگەڵ ئەڵەمانەکاندا بکات، جەنەراڵ (عەلی ئیحسان سابیس)، نوری گیللیگیل)ی برای (ئەنوەر پاشا)، پرۆفیسۆر (زەکی وەلید تۆگان)، پرۆفیسۆر (ئەحمەد جەعفەر ئۆغلو)، سکرتێری گشتی (پ گ ك) (مەحمود شەوکەت ئەسندال)، (ئەمین رەسلوزادە)، سەرەك وەزیر (شوکری سەراج ئۆغلو) و پەرلەمانتار (ئەمین باخچە)، بێ چەندو چوون لایەنگری نازیەکان بوون و چاوەڕێی سەرکەوتنی نازیەکانیان دەکرد (بەڵگەنامە نهێنییەکان، پەیوەندییەکانی تورك-ئەڵمان لە شەڕی دووەمی جیهانیداو دۆستە تورکەکانی هیتلەر، Istanbul 1968, May Yayinlari، ل 76—94).

2-فاکتی دووەم سی و سێ گوللەیە ئەم فاکتەشمان بە پشتبەستن بە تۆماری کۆنووسەکەی پەرلەمان و قسەی شایەتکار بە درێژی باسکرد ڕووداوی (سی و سێ گولله) له 1943داو، قسەکەی جەنەراڵ (موغلالی) کە بە موفەتیشی گوتبوو: "من فەرمانم لە شوێنی بەرزەوە وەرگرتووە، کە ڕێگربم بۆ گوندنیشنە ئەدارو بێ تاوانەکانی کورد، کە لە نزیکەوە پەیوەندییان هەیە لەگەڵ دوژمن. لە قەڵەمدانی کورد لە لایەن (پ گ ك)"[4] وە لە ساڵی 1930دا، ئەم دوو فاکتە، فاکتی لە یەك جیاو شتی جیاجیانین. لەناو ڕەهەندی کات و شوێندا (یەکێتی) یەك پێك دێنن و پەیوەندی یەکگرتن و تەواوکردنیان لە نێواندایە. وەکو دێتەوە یاد، گوللەبەرانەکە لە دزڵی کۆکتۆ (چیللی)ی چاڵدێراندا جێبەجێکراوەو موفەتیشی گشتی باسکراویش (عەونی دۆغان) بووە.

3-فاکتی سێیەم پەیوەستە بە مانگەکانی هاوینی ساڵی (1945)ەوە. سەرەك کۆماری سەردەم و پێشەوای نەتەوەیی (عیسمەت ئینونو) قۆڵ دەکا بە قۆڵی سەرلەشکر (مستەفا موغلالی)دا کە بەرپرسیاری یەکەمی ڕووداوی (سی‌و سێ گولله)یەو، دێت بۆ وان، گوتاربێژەکان لە گوتارەکانی خۆیاندا سەبارەت بە ڕووداوەکە باسی ئەمەیان کردووە. دیسان وەکو لەو گوتارانەدا باسکراوە، پێشەوای نەتەوەیی و سەرەك کۆمار (عیسمەت ئینونو) بۆ چاوترسێن کردنی کورد ئەمەی کردووە. بۆ ئەوەی بڵێن: "بکوژی ئێوە باشترین پیاوی منە من لەگەڵ ئەوانەدام کە کورد دەکوژن و ئاگاداری ئەم کارەشیانم". لەو بەشەدا کە تایبەتە بە ڕووداوی "سی‌و سێ گولله"، گوتوومانە کە لەو سەردەمانەدا هاوتەریب لەگەڵ ڕەگەزپەرستی نازیدا، ڕەگەزپەرستی تورکیش پەرەسەندنێکی گەورەی بەخۆیەوە دیوەو حکومەتیش هانیداوە.

4-فاکتی چوارەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی بلند ئەجەویت سەرۆکی (پ گ ك) بووە. لە مانگی نیسانی ساڵی 1973دا، 13 ئەندامی (پ گ ك) بەو بیانووەی پەیوەندییان بە ڕێکخراوێکی نهێنییەوە هەبووە، براون بۆ فەرماندەیی ئیدارەی عەسکەری. لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکانداو پاش ئەوەی (پ گ ك)یش بۆیان تێکەوتووە، هیچ بەڵگەیەکی تاوان لەسەر ئەو (13) کەسە دەستنەکەوتووەو لەلایەن دادگاوە ئازادکراون. بلند ئەجەویت لەسەر ئەمە قسەی وەکو "بڕوای بێپایانمان بە دادوەرە تورکە بەشەرەفەکان هەیە". "دادگەری تورکی زیندوو لەسەر پێیە"ی کردووە بڕیاری ژمارە (68/1973)ی دادگای عەسکەری ژمارە (1)ی فەرماندەیی ئیدارەی عەسکەری شارەکانی دیاربەکر- سیعرت، کە ئەندامەکانی (پ گ ك)ی ئازادکردووە، لە ڕۆژنامەی (خەڵك Halk)دا بڵاوکراوەتەوە. لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ئەم بەڵگەنامەیەدا بۆ ڕای گشتی ئەم هەواڵەش بڵاوکراوەتەوە:

"، نموونەیەکی هەڵبژاردە لە خەبەرلێدانی بێبەڵگەو بێدەلیل و بێنیمزا. ئەرکی ئاشکراکردنی تەنها یەکێك لەو (بەڵگنامە تازانە)ی لە دەستی ئەجەویتدایە کەوتە سەرشانی ڕۆژنامەکەتان، ڕۆژنامەی (خەڵك). بەڵگەنامەی پەیوەست بە دیوی ناوەوەی چیرۆکی لە ماڵ دەرهێنانی 13 هاونیشتمانیمان و ڕاپێچکردنیان بۆ دیاربەکر، کە یەکێکیان (بایهان بارلاس)ی بەڕێوەبەری ڕێکخراوی شاری (غازی عەنتەب)ی (پ گ ك)یە. دادوەرە بە شەرەف و دادپەروەرەکانی تورك، دیوی ناوەوەی مەسەلەکەیان ئاشکرا کردووە"[3].

هەڵسەنگاندنی بلند ئەجەویت و (پ گ ك) بۆ دادوەرەکانی فەرماندەیی ئیدارەی عەسکەری شارەکانی‌سیعرت- دیاربەکر بەو جۆرەیە. ئەمە لە کاتێکدایە کە ئەو دەسەڵاتدارانە، تایبەتمەندییەکی بێئەندازە گرنگیان هەیە کە هەرگیز نابێ لەبیر بکرێ. ئەو دادگایانە دادگای (کۆلۆنی)ن. لەو دادگایانەدا کوردایەتی نەتەوەی کورد دادگایی کراوە، نەك هیچ جۆرە تاوانێکی دیاریکراو. ئەوانە دادگایی کراون کە دژی تورکاندن وەستاون ویستوویانە تایبەتمەندییەکانی (کۆمەڵگەی کوردی بوون) بپارێزن و درێژەی پێبدەن. ئەم دادوەرە تورکە (بە شەرەف) و (دادپەروەر)انە، ویستوویانە کوردەکان نکۆڵی لە کەسێتی و شەرەفی خۆیان و کەسێتی و شەرەفی نەتەوەی کورد بکەن. درۆ بکەن و سوکایەتی بە نەتەوەی کورد بکەن. ئەوانەش کەسووکایەتی بە نەتەوەی کورد ناکەن و داکۆکی لە شەرەف و کەسێتی خۆیان و شەرەفی نەتەوەی کورد دەکەن، حوکمی سزای سەنگینیان بەسەردا داون کە دەگاتە 16 ساڵ زیندان. دادگایەك کە تیایدا ئەوەی دەڵێ "کورد نییە، هەموو کەس تورکە" دەیباتەوەو ئەوەی دەڵێ "کوردم" حوکم دەدرێ، مانای وایە چەمکی وەك (دادپەروەری) و (بە شەرەف) بوون، بە پێی نەتەوەی چەوسێنەرو نەتەوەی چەوساوە دەگۆڕێن. بەلای کەسانی ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیالیی سەر بە نەتەوەی چەوسێنەری وەك بلند ئەجەویتەوە، ئەو دادوەرە کۆلۆنیالیانەی نەتەوەی کورد خەڵتانی خوێن دەکەن، دەتوانن "دادپەروەری"ی تورك بەرزبکەنەوە. بەڵام نەتەوەی کورد زۆر چاك دەزانێ ئەو "دادپەروەری"یەی پتر لە 50 ساڵە لە کوردستاندا دژی نەتەوەی کورد پیادە دەکرێ، چ جۆرە دادپەروەرییەکە. ئەو (دادپەروەری)یە تورکییەیە کە لە کوڕەزاوە دەستیکردووە بە هەڵواسینی سێ نەوەی کوڕو باوك و کوڕەزا، بە بەرچاوی یەکترییەوە. هەر هەمان "دادپەروەری" تورکییە کە کوپە زێڕو خانوو و ئاپارتمان و ڤێللای بە خاوەنی ئەو بڕیاری لە سێدارەدانانە بەخشیوە. ڕاگواستنی بە کۆمەڵ و کۆکوژیەکانیش دیسان دەسکردی "دادپەروەری" تورکین. هۆی هەموو ئەوانە چییە؟ بۆ لەناوبردنی شەرەف و کەسێتی نەتەوەیی نەتەوەی کورد، بۆ کۆیلەکردنی کوردو سڕینەوەی ناوی کوردو ناوی کوردستانە، لە زمان و مێژوودا. ئا ئەمەیە پوختەیەکی کورتی پیادەکردنی "دادپەروەری"ی تورکی دژی نەتەوەی کوردو کوردستان.

هەڵوێستی ساڵی (1973)ی بلند ئەجەویت کە ستایشی "بە شەرەفی" و "دادپەروەری"ی ئەو دادوەرانە دەکات کە سزای قورسی کوردەکان دەدەن هەر

لەبەرئەوەی کوردن؛ هیچ جیاوازییەکی نیە لەگەڵ هەڵوێستی ساڵی (1945)ی پێشەوای نەتەوەیی و سەرەك كۆمار (عیسمەت ئینونو)دا، کە قۆڵ لە قۆڵی جەنەراڵی پیاکوژدا دێت بۆ وان. پێشەوای نەتەوەییٚ و سەرەك كۆمار عیسمەت ئینونو، بەم هەڵوێستەی هەوڵ ئەدا کوردەکان چاوترسێن بکاو نیشانیان بدات لایەنی پیاکوژان دەگرێت. هەڵوێستی ساڵی 1973ی سەرۆکی (پ گ ك) (بلند ئەجەویت)یش هەر ئەمەیە. سەرۆکی گشتی (پ گ ك) بە ئاشکرا لایەنی ئیدارەی عەسکەری شارەکانی سیعرت-دیاربەکرو ئەو دادوەرو داواکارە گشتییانە دەگرێ، کە هەوڵدەدەن بڕیارە سیاسییەکانی ئیدارەی عەسکەری لە ڕێی چەمکە (یاسایی)یەکانەوە ڕابگەیەنن. یەکێتییەکی دیالەکتیك لە نێوان ئەم دوو فاکتەی 1945 و 1973دا هەیە . (پ گ ك)، هەمان (پ گ ك)یەو ئاوەڕۆکی بیروبۆچوونی سەرۆکە گشتییەکانیشی لە مەسەلەی کێشەی نەتەوەی کورددا، وەکو خۆیەتی. با هەوڵبدەین زیاتر فاکتەکانی ساڵی 1973 ڕوون بکەینەوە:

لە سەرەتاکانی ساڵی 1973، فەرماندەیی ئیدارەی عەسکەری شارەکانی سیعرت- دیاربکر، قوتابیانی ئامادەیی لە ناوچەی وەك سیفەرەك، تونجەلی، ئەرگانی، سیلڤان، تاتڤان، قزل تەپەو موش و.. هتد دەسگیر دەکرد. قوتابیان زوو زوو دەبران بۆ ڕێکخراوی ئیستخباراتی میللی (میت) و لەوێ ئەشکەنجە دەدران. ڕۆژی 1ی مارتی 1973، دیسانەوە ویستیان قوتابیەکان لە ژوورەکانی بەندیخانە دەربێنن. دەیانگوت "داواکاری گشتی داوایان دەکات". لە ڕاستیدا دەیانبردن بۆ (میت). زیندانییەکانی تر لەبەر ئەوەی بە باشی لەمە گەیشتبوون، ئەم هاوڕێ گەنجانەیان تەسلیمی بەڕێوەبەرانی ئیدارەی عەسکەری گرتووخانە نەکرد. مشتومڕی دوورو درێژ لە نێوان گیراوەکان و بەڕێوەبەرانی گرتووخانەی ئیدارەی عەسکەریدا ڕوویدا. گفتوگۆکان تا نیوە شەویان خایاند قوتابیەکان تەسلیم نەکران. دۆخەکە جۆرێك لە هێمنی بەخۆیەوە دی ماوەی دوو سێ سەعات تێپەڕی. کتوپڕ باروودۆخەکە شێوا. بە فەرمانی (فەرماندەیی ئیدارەی عەسکەری)، هێرشێکی چەکدارانەی بەهێز بۆ سەر گرتووخانەکە دەستپێکرد. گوللەی ڕاستەقینەو بۆمبای گاز دژی ژوورەکانی بەندیخانە بەکارهێنران. لەگەڵ ئەم هێرشەدا کە بەرەبەیان دەستپێکرد گیراوەکان ئاگادار دەکرانەوە کە دەبێ لە ماوەی پێنج خولەکدا لە ژوورەکانیان بێنە دەرێو بچنە ناو باخچەکە، ئەگینا ژوورەکان تەخت دەکرێن. پێش ئەوەی پێنج خولەکەکە تەواو بێت، هێرشەکە دەستپێکرد. ئەوانەی لەژێر کاریگەری گوللەو گازدا بە هەزار زەحمەت خۆیان فڕێدەدایە دەرێ، بەر شەق و لێدانی پیاوانی داربەدەست، قامچی بەدەست، شەق وەشێن و تفەنگ بەدەست دەکەوتن. لەم ڕووداوانەدا گەلێك کەس بریندار بوون. لەبەرئەوەش کە لە تاریکیدا ڕوویاندەدا، نەدەزانرا کێ لە کێی داوە. پاش ڕووداوەکان، 34 کەس لە ژوورە تەنهاکان توندکراون و چەندی مانگ لەوێ هێڵرانەوە.

لە کاتێکدا کە ئەم کردەوە تیرۆریستییانە دژی گیراوەکان بەڕێوە دەچوو، لە ژووری تەنیا توند دەکران، فەرمانبەرانی بەندیخانە خۆیان کرد بە ژوورەکانی زینداندا کاغەز، ڕۆژنامە، کتێب، تایپ، بە کورتی هەرچی پەیوەندی بە قەڵەم و نووسینەوە هەبوو. کۆیان کردەوەو پێچایانەوەو بە شێوەیەکی تێکەڵ و پێکەڵ بردیاننە دەرەوە. بەشێکیان سووتاند، بەشێکیشیان لە بەفرو قوڕ هەڵکێشا. ئەوەی بە دڵی خۆشیان بوو بۆ خۆیان جیایان دەکردەوە.

پارێزەر (شەرەفەدین کایا) و پارێزەر (ڕوشەن ئاسلان) کەوتنە پەیجووری ڕێگەی گەیاندنی ئەم پەلامارە دژی مرۆڤانەیە بە سەرچاوە پەیوەندیدارەکانی ئەنقەرە سەرەڕای هەموو گوشارو ڕێگرییەك گەیاندیان. فەرماندەیی ئیدارەی عەسکەری بەرامبەر بە گەیاندنی ئەم کارە تیرۆریستی و پەلامارانە بە ئەنقەرە. کاردانەوەیەکی گەورەی نیشانداو پارێزەرەکانی دەسگیر کرد.

هەرچەندە هەموو لایەك بەم کردەوە تیرۆریستانەیان زانی، بەڵام نە چاپەمەنی هیچ کاردانەوەیەکی هەبوو، نە ڕێکخراوە دیموکراتییەکان" و نە سەرکردەی حیزبەکان و نە دەزگاکانی تریش، هەر هەموو بێدەنگ بووبوون. چونکە ئەم پەلامارانە دەکرانە سەر کوردو بیرو بۆچوونە سیاسیەکانیان[6].

هەواڵی ئەم ڕووداوانە، لە نێوان کەس و دەزگای جیاجیادا، بە بلند ئەجەویت و (پ گ ك)یش گەیەنرا. کەس دەنگی لێوە نەهات. نزیکەی دوو مانگ پاش ئەم ڕووداوانە، ڕووداوەکەی سەرەوەن واتە ڕووداوی ئەندامانی (پ گ ك)ی خەڵکی (غازی عەنتەب) هاتە کایەوە، بەم جۆرە بلند ئەجەویت لە ڕێی ڕووداوەکانی (2)ی مارتی (1973)وە هەڵوێست و ڕەفتاری خۆی بەرامبەر بە کورد ئاشکرا کرد. چۆن؟ بەوەی کە بە ئەندامانی دادگاو ئەوانەی ڕۆژی (2)ی مارتی (1973) هێرشی چەکداریان کردە سەر ژوورەکانی بەندیخانە، یاخود لانی کەم بە هاندانی هێرشەکە دەڵێت: "بە شەرەف" و "دادپەروەر". بۆ کێ "دادوەر" و "بە شەرەف"؟ بێگومان بۆ کۆلۆنیالیزمی تورکی.

بە هەمان شێوە دادوەرێکی کۆلۆنیاڵ لە ڕۆژنامەی (جمهوریەت)دا باسی یاساو دادپەروەری و یەکسانی دەکاو چەندین وتار لەسەر مەسەلەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵ بە پێی یاسا دەنووسێ. دەڵێت قازی "دادوەر" لە تورکیادا، بە هیچ جۆرێك ئازادی بیروڕا تەسك ناکاتەوە. بەڵام بە تایبەت جەخت لەوەش دەکات کە ئەمە مانای "ئازادی بۆکوردیش" ناگەیەنێ و پێویستە کورد بەردەوام لە ژێر باری ستەمی کەمالیستەکاندا بژێ. شیعرو شانامە بەشان و باڵی مستەفا کەمالێکدا هەڵئەڵێت کە کوردستان و نەتەوەی کوردی دابەش و پارچە پارچەو کۆیلە کردووە[7]. ئەم قازییە کۆلۆنیالییە ئەوەندە شەیدای چەمکی مافەکانی مرۆڤە کە لە ساڵڕۆژی جاڕی گەردونی مافەکانی مرۆڤدا (10ی کانوونی یەکەمی 1971)، دانگایی کردنی خانەی کولتوری شۆڕشگێڕی خۆرهەڵات (DOKO)ی دەستپێکردووە. لەسەر بیروڕاش، ژمارەیەکی زۆر لە شۆڕشگێڕو دیموکراتەکانی بە نزیکەی (16) ساڵ زیندان سزاداوە. دووبارە ویستوێتی دەرچوونی حوکمەکە بکەوێتە ڕۆژی (10ی کانوونی یەکەم)ەوە، بەڵام لەبەرئەوەی 10ی کانوونی یەکەم بەر ڕۆژی یەك شەممە کەوتووە، لە 11ی کانوونی یەکەمی 1972)دا ڕاگەیانراوە.

دادوەری "دادپەروەر"ی تورکی ناوبراوێ سەرباری ئەوەی کوردە دیموکرات و شۆڕشگێڕو نیشتمانپەروەرەکان، تەنها لەبەر کورد بوون و داکۆکی کردنیان لە شەرەفی نەتەوەی کورد، بە نزیکەی 16 ساڵ زیندان سزا دەدات. هێشتا داکۆکی کردن لەوەی کە نەتەوەیەك نییە ناوی کورد بێ و کوردەکان تورکن، لەبیرناکات بۆ نموونە ئەو وتارەی لە ڕۆژنامەی (میللیەت)ی بەرواری 27ی ئەیلولی 1978دا بە ناونیشانی "دادپەروەرو ڕیشەی تیرۆر لە تورکیادا" نووسیوێتی، نمونەیەکی ئەمەیە. لەم وتارەدا بە تەواوی وەك نووسەری ڕاپۆرتی پۆلیس بڕیاری دادگا (ڕزگاری، ژ-2، ل 13) هەوڵدەدا بیسەلمێنێ کوردەکان تورکن. دیسان لە هەمان نووسیندا، دادوەری "دادپەروەر" ئیدیعا دەکات ئەتاتورك "ڕێگەی بۆ هەموو مرۆڤە چەوساوەو ژێردەستەکان هەموار کردووە، تا هەرچی زووتر هۆشیار ببنەوەو ببنە خاوەنی مافەکانیان "واتە" ڕێگەی بۆ نەتەوە کۆیلەکانی خۆرهەڵات ڕووناك کردۆتەوە". ئەم دادوەر "دادپەروەر"ەی بلند ئەجەویت، لە وەڵامی پرسیاری وەك ئەمانەی خوارەوەدا، چی لە دەست دێ بیکات؟ ئەگەر مستەفا کەمال "نەتەوە کۆیلەکانی خۆرهەڵاتی هۆشیار کردۆتەوە" و ڕێگەی بۆ ڕزگار بوونیان "ڕووناك کردۆتەوە"، بۆچی لە پێناوی دابەش و پارچە پارچەکردنی کوردستان و بە تاڵان بردنی سەرچاوە سروشتییەکانیدا؛ هاوکاری ئیمپریالیزمی ئینگلیزی کردووە؟ بۆچی هەموو توانایەکی ئایدیۆلۆجی و سیاسیی لە پێناوی دابەش و کۆنترۆڵ کردنی نەتەوەی کورددا خستۆتە گەڕ؟ بۆچی مافە نەتەوەیی و دیموکراتییەکانی نەتەوەی کوردی زەوت کردووەو

ژێرپێی خستوون؟.. بێگومان هیچ شتێك. خۆی لەم پرسیارانە دەكاتە كەڕو كوێر. یاخود بە پێی شوێن و كاتی خۆی بە ناوی ئەوەوە كە "یەكپارچەیی دەوڵەت لەگەڵ وڵات و میللەتدا تێكدەدەن"، سزای خەڵكی دەدات چونكە ئەو دادوەرێكی ((دادپەروەر)ە. لەگەڵ خۆیدا لێكی دەداتەوە. ئەركی سزادانی ئەو كەسانەیە كە دەڵێن "كوردم و مافە نەتەوەییەكانی خۆمم دەوێ". ئەركی ئەو ئەوەیــە لەگــەڵ گوتنــی "كــورد بوونــی نیــە، هــەموو كــەس توركــە"دا، "دادپەروەری" ببەشێتەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانە، ناتوانین لەوە نەپرسین: ئایا ئێستاش ڕێكخراوی ئیستخباراتی میللی (میت)، پێویستی بەو نووسینە پۆلیسـییانە مـاوە كـە هـەوڵدەدەن تـورك بوونـی كـورد بسـەلمێنن؟ هێشـتا هەستدەكات پێویستی بەو دادوەرانە هەیە كە لەگـەڵ گوتنـی "دادپـەروەری دەبەشمەوە"دا كاری پۆلیسی دەكەن و، ڕاپۆرتی پۆلیسی دەنووسن و ناوی "بڕیاری دادگا"ی لێدەنێن؟

5-فاكتی پێنجەم، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمەی كە سەرۆكی گشتی (پ گ ك) بلند ئەجەویت، سەرۆك وەزیر بووە.

هەردوو ڕۆژنامەی (یەنی ئۆرتام Yanı Ortam) و (میللییەت)ی بەرواری 1ی تەمووزی 1974، ئەم هەواڵەیان بڵاوكردەوە:

".. فڕۆكەیەك كە نازانرێ هی چ وڵاتێك بوە، گوندە سنورەیەكانمانی بۆردومـان كـرد. ڕۆژی ڕابـردوو، دەوروبـەری سـەعات سـێی پـاش نیـوەڕۆ فڕۆكەیـەكی نەناسـراو لـە ئاسمـانی (هـەكاری)دا بینـراوەو گونـدی (بـەیت شەباب)ی بۆردومان كردووە. فڕۆكەكە چیای (سوومبوول)ی نزیـك هـەكاری بۆردومان كردووەو بەرەو گوندی (ئولتوچا) فڕیوە پاش بۆردومانی ئەوێش ڕاستەوخۆ بەرەو (شەمدینلی) فڕیوە. گوندی (گیرانە)ی بۆردومان كردووە كە یەكێكە لە گوندە سنووریەكانی شەمدینلی و پاشان گوندی (هیلالی)ی سەر بە (ئولودەرە)یشی بۆردومان كردووە كە دەكەوێتە سەر سنووری عێراق و دیار نەماوە. پەیوەندیدارەكان كەوتوونەتە گەڕان بـە دوای پێناسـەی فڕۆكەكـەدا. بۆی هەیە فڕۆكەكە هی هێزی ئاسمانی عێراق بێت".

ڕۆژنامەكانی هەمان ڕۆژ ئـەو هەواڵـەش بڵاودەكەنـەوە كـە سـەرەك وەزیـر ئەجـەویت لەگەڵ یاریدەدەری سەرۆكی ئەنجومـەنی سـەركردایەتی و سـەرەك وەزیـری عێـراق (سـەدام حسـێن)دا، لـە فڕۆكەخانـەی (ئەسـتەنبوڵ) دیـدارو گفتوگۆ دەكات. ڕایدەگەیەنن لەم دیدارەدا بە تایەبتی باسی كێشـەی نەتـەوەی كورد دەكرێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ گفتوگۆ لەسەر ئەو ڕێو شوێنانە دەكرێ كە بۆ تێكۆشانی هاوبەش دژی كورد پێویستن.

دیداری نەخشـە بـۆ كێشـراو، لـە بـەرواری 1ی تـەمووزی 1974دا سـازكرا. ڕۆژنامـەكانی ڕۆژی 2ی تـەمووزی 1974 باسـی ئـەوەیان دەكرد كـە گفتوگۆكـان جارێك دوو و جارێكیش پێنج سـەعاتی خایـاندووەو لـە كـەش و هەوایـەكی بێئـەندازە دۆسـتانەو گـەرمدا بـەڕێوە چـوون. لـە ڕێـو ڕەسمـی پێشـوازی و بەڕێكردنیشـدا، هەردوو سـەرۆك وەزیر یـەكیان لـە ئـامێز گرتـووە. ئـا لـێرەدا پرسـیارێك هەیە كە بێ چەندو چوون پێویسـتی بـە وەڵامدانـەوە هەیـە. ئـەو فڕۆكە (نەناسراو)ەی گوندە كوردنشینەكانی ناو سنووری توركیای بۆردومـان كـرد، هـی كـێ بـوو؟ بۆچـی لـە كۆتـایی گفتوگۆكـاندا ئـەم مەسـەلەیە ڕوون نەكراوەتەوە؟ یاخود ئەم هەواڵە بە درۆ نەخراوەتەوە؟ ئەگەر هەمان ڕووداو لە سەر سنووری بولگاریا یاخود لەسەر سنووری یۆنانیش ڕووبدات ئایا ئـەو كەسەی لەسەر كورسی سەرۆك وەزیران دادەنیشێ، بە تایبەتی لە ڕۆژگارێكی وەكو ئەوسادا، پاش گفتوگۆیەكی گەرم و دۆستانە لەگەڵ سـەرۆك وەزیـری بولگاریا یاخود یۆناندا، نابێ ڕوونكردنەوەیەك لەسەر مەسەلەیەكی ئاوا بـە ڕای گشتی ڕابگەیەنێ؟

سەرۆك وەزیر بلند ئەجەویت بە پێویستی نازانێ هیچ ڕوونكردنەوەیەك لەسەر ئەم مەسەلەیە، واتە بۆردومان كردنی گوندە كوردییەكانی ناو توركیا لە لایـەن (فڕۆكـە نەناسـراوەكانەوە)، بڵاوبكاتـەوە (ئاشـكرایە فڕۆكەكـە یـا هـی عێراقە یا هی توركیایە، ڕۆژنامەكان ئاماژەیان بەوە كردووە كە پێیان وایە هی عێراق بووە). بەڵام ئەوە بڵاودەكاتەوە كە هەمان ڕۆژ، لەگەڵ سەرۆك وەزیری عێراقدا گفتوگۆیەكی گەرم و گوڕو دۆستانەی كردووە. سـەرۆك وەزیـر بلنـد ئەجەیت بەم هەڵوێستەی، بە ڕوونی هەڵوێستی دوژمنانـەی خـۆی بەرامبـەر كـورد ئاشـكرا دەكـات. هەڵوێسـتی پێشـەوای نەتـەوەیی و سـەرەك كۆمـار عیسمەت ئینونو كە لە 1943دا قوڵ دەكات بە قوڵی سەرلەشكری پیاوكوژدا، هیچ جیاوازیەكی نییە لەگەڵ هەڵوێستی ئەجەویتدا كە سەدام حسێن لە ئامێز دەگرێت، ئەو كەسەی قەسابی كوردەو بە وەحشیترین شێوە سیاسەتێكی ڕەگەزپەرست و كۆكوژی و كۆلۆنیالی لە باشووری كوردستاندا پیادە دەكات. كەسێك كە چەپڵە بۆ سەدام حسێن لێدەدات و هیچ لێكۆڵینەوەیەك لەسەر (فڕۆكـە نەناسـراوەكان) ناكـات، هـەر بـەم هەڵوێسـتەی خـۆی بـە ئاشـكرا ڕایگەیاندووە هەڵوێستی دوژمنانەی بەرامبەر بە نەتەوەی كورد هەیە. ئیتر ئەمە پێویستی بەوە نییە جارێكی تر بە قسە یاخود بە نووسین ڕابگەیەنرێ. لە ڕاستیدا دەستی بلند ئەجەویت هەر ئەو كاتە بە خوێنی كورد سوور بوە. ئەوكاتـەی بەعسیە ڕەگەزپەرسـت و كۆلۆنیالییـەكان بـەردەوام بـوون لەسـەر كۆكوژیەكانیان لە كوردستاندا، منداڵانی كوردیان بە بۆمبای ناپاڵم و گازی ژەهـراوی و بۆمبـای فۆسـفۆری بـە كۆمـەڵ دەكوشـت، دارسـتانەكانی كوردستانیان دەسوتاند، سەرچاوەی ئاوەكانیان ژەهراوی دەكرد، گوندەكانی كوردیان وێران دەكرد، هەموو ئەو كردەوانەیان بە هاوكاری ئەو حكومەتەی توركیا ئەنجام دەدا، كە بلند ئەجەویت سەرەك وەزیرانی بوو. پاشان هەمان ئەو كردەوانە لەگەڵ (سلیمان دەمیرێل)دا پێكەوە ئەنجامدەدرا. سەرەك وەزیر بلند ئەجەیت زۆر چاك ئەوانە دەزانێ. بەڵام باش دەزانێ كە چاپەمەنی توركی، "چەپ"ی تورك و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی توركی و توركە دیموكراتەكان لەم ڕووداوانە ناپرسنەوە. هەر لەبەر ئەم نەپرسینەوەیەشە زۆر بە ئاسوودەیی بەردەوامە لەسەر ئەو كردەوانە"[8]

كوردەكـان بـە تـورك لـە قەڵـەم دەدران. ئـەم تێكدانـی ئاسـوودەییەی "توركەكان" لە لایەن گروپە كوردیەكانەوە، بەڕێوەبـەرانی كۆلۆنـی و حیزبـە سیاسیەكان و چاپەمەنی و ڕادیۆو تەلەفزیۆنی (TRT) و.. هتد زۆر ناڕەحەت دەكـرد. ئـەدەبیاتێكی چـڕو فراوانـی "جیابوونـەوە خـوازی" دەستپێكرد. لەبەرئەوەی حكومەت نەیتوانی بوو بە باشی "توركەكان" بەرامبەر ئەم گروپە كوردە شەڕكەرانە بپارێزێ، بەر ڕەخنەی چڕوپڕ كەوت.

لـەم ماوەیـەدا حكومـەت دەسـتیكرد بـە جێبـەجێكردنی بـەناو "پـرۆژەی گەیاندن بە گوند". هەمیشە لەو ساتانەدا كە بزووتنەوەی نەتەوەی كورد لە بەرزبوونەوەدا بووە، حكومەتەكان دەستیان داوەتە جێبەجێكردنی ئەم جۆرە پرۆژانـە، بـەو نـاوەی گوایـە "خزمـەت" دەگەیـەنێ. لە لایەكـەوە بـۆ ئـەوەی ئاسانترو باشـتر عەسـكەر، تەقەمـەنی، تـۆپ و تفـەنگ بـۆ گوندەكـان بنـێرن. پەلەیان لە دروستكردنی ڕێگاكان كردووە، لە لایەكی تریشەوە وەكو "خزمەت بە گوند" پێشكەشیان كردووە. ئەمەیە بە بەردێك دوو نیشانە شكاندن.

سەرەك وەزیر بلند ئەجەویت بۆ "خستنەكار"ی پرۆژەیەكی ئاوا لە 18ی حوزەیرانی 1974دا چوو بۆ (شەمدینلی)، ژمارەیەكی زۆر ڕۆژنامەوانیش لەگەڵ سەرەك وەزیـردا بوون. ڕۆژی دواتر نووسـەری وەك (مـەتین تۆكەر)، (جونـەیت ئارجـایورەك)، (ئۆرسـان ئۆرمـان) و (حوسـامەدین چەلـەبی)، پێشـنیاری جۆربەجۆریان پێشكەشی حكومەت دەكرد بۆ باشتر پاراستنی "توركەكان" و دابینكردنی ئاسوودەیی. ئەو ڕۆژانە نوسەری وەك (ئیلهان سەلجوق) و (یلماز چەتینەر)یـش ئـەم بابەتـەیان بـەكاردەهێنا. لـە ڕاسـتیدا مەبەسـت پاراسـتنی "تـورك" و "گوندنشـینە توركـەكان" و دابینكردنـی ئاسـودەیی نـەبوو. بـەڵكو مەبەست ڕێگەگرتن بوو لە پەرەسەندنی بزوتنەوەی نەتەوەی كورد. لە ڕاستیدا

ئەو ڕۆژانە کوردستانی باشوور لە لایەن ڕژێمی ڕەگەزپەرست و کۆڵۆنیالی بەعسەوە بە بۆمبای ناپاڵم خاپوور دەکرا. گوندو دارستان و کشتوکاڵ و ئاژەڵەکانی دەسووتێنران و گەورەو بچووک ناچار دەکران بە کۆمەڵ خاك و وڵاتی خۆیان بەجێبێڵن. ئەم بۆمبا ناپاڵمانە، هۆشیارانەو بە ئەنقەست بەسەر ئەو بەشەی کوردستانیشدا دەپارێنران کە درابووە دەست ڕژێمی کۆڵۆنیالی تورکیا. بە تایبەتی گوندەکانی سەر بە (شەمدینلی). ڕەگەزپەرست و کۆڵۆنیالیستە تورکەکان لە کاتێکدا کە هەوڵێکی زۆریان دەدا بۆ هەژاندنی ڕای گشتی بۆ پاراستنی ئاسوودەیی "تورك" و دابینکردنی ئاسایش بۆ "گوندنشینە تورکەکان" لە دەس گرووپە کوردیە شەڕکەرەکان، کەچی لە بەرامبەر بۆمبا ناپاڵمەکاندا بێدەنگییەکی قووڵ دای دەگرتن. چونکە ناوچەکە، کە لە سییەکاندا بە دوژمن ناودێر دەکران و لە 1943دا بە فەرمانی ئیداری و عەسکەری گوللەباران دەکران، ئێستا وەکو "برا"و "ئەو دۆستەی ئازارەکانی دەگاتە دڵ" ناودێر دەکران. هەموو کەس و دەزگاکان کەوتنە پێشبڕکێ لە یارمەتی دانیاندا. ئا لێرەدا جارێکی تر جیاوازی ئەو کۆڵۆنیالیزمیەی لە کوردستاندا پیادە دەکرێ لەگەڵ کۆڵۆنیالیزمی کلاسیکدا، دەبینین.

بۆ نموونە با ئەفریقا وەرگرین، لە سەدەی حەڤدەهەمدا، خەڵکی ڕەسەنی ئەفریقا بەلای ئەورووپاییەکانەوە کێویو وەحشی بوون. لە سەدەی هەژدەهەمدا ئەم تێڕوانینە بڕێك گۆڕاوە. پێیان وتراوە (کێوییە ئازیزەکە). تەنانەت هەندێ لە بیریارە ئەورووپاییەکان شەرمەزاری خۆیان دەربڕیوە لەو



مەبەستیان لەناوبردنی خەباتی پەرەسەندووی نەتەوەیی دیموکراتی بوو، نەك دابینکردنی – لە 24ی تشرینی 1976دا، بوومەلەرزەیەکی گەورە لە ناوچەکانی (موورادیە، چاڵدێران، ئەرجیش و ئۆزالپ)دا ڕوویدا. بە پێی ئامارە ڕەسمییەکان، 3800 کەس گیانیان لە دەستدا. ڕوودانی بوومەلەرزەکە لە ناوەڕاستی زستاندا، ئەوەندەی تر زیانە گیانی و ماڵییەکانی زیادکرد. ئەو خاڵەی جێگەی سەرنجەو پێویستی بە لەسەر وەستان هەیە، ئەمەیە: خەڵکی سیاسەتە کۆڵۆنیاڵییەی کە دەوڵەتەکانیان لە ئەفریقادا پەیڕەوی لێدەکەن. وەسفکردووە. واتە لە لایەن ئەورووپاییە (شارستانی)یەکانەوە، وەکو مرۆڤێك وەرگیران کە پێویستە "بە شارستانی بکرێن و بکرێنە خاوەنی کولتوورو شارستانێتی". ئەفەریقای سەدەی بیستەمیش یەکێکە لە گرنگترین ئەندامەکانی "جیهانی سێهەم". وەکو بینرا، تێڕوانینی دوڵەتە کۆڵۆنیالە ئەورووپاییەکان بۆ گەلانی ئەفەریقا لەناو پرۆسەیەکی مێژوویدا، بەردەوام لە

گۆڕاندا بووه. بەم شێوەیە گەلانی ئەفەریقا یەك لە دوای یەك سەربەخۆییان بە دەستهێناوە دەوڵەتی خۆیان دامەزراندووە. وەکو ئەوە وایە کۆمەڵگەی کۆلۆنی لە ئەفریقادا نەمابێ.

هەرچی بارودۆخی کوردستانیشە، گەلێك جیاوازە. بە ناردنی لەشکر بۆ سەر کوردستان و جینۆسایدی نەتەوەی کورد، ئەوە ڕاگەیەندراوە کە کورد قەومێکە لە تورك جیایە، ئەم قەومە لە هیچ ڕوویەکەوە لە مرۆڤ ناچێ و چۆن ڕەفتار لەگەڵ گیانەوەراندا دەکرێ، دەبێ ئاواش لەگەڵ ئەم قەومەدا بکرێ. داکۆکیشی لێکراوە. لە ئەفریقاشدا ئەم ئەندازەیە هەیە. لە کاتی پێکدادانە چەکدارییەکاندا ئەم ڕێگەیە دەگیرێتەبەر، بۆ بەرگرتن لە پرسیاری وەك "ئەگەر ئەمانەش تورکن، کەواتە بۆچی دەیانکوژین؟" لە لێکۆڵینەوەی (یاسای تونجەلی)دا ئەم بابەتە بە ئەندازەی پێویست باسکراوە. بەڵام پاش لە خوێندا خنکاندنی بەرخۆدانەکانی کوردو گەورەبوونی کاریگەری گوشارە ئایدیۆلۆجی و سیاسی و ئابوورییەکان لەسەر کۆمەڵگەی کوردی دەڵێن هەموو ئەوانەی لە تورکیادا دەژین تورکن و هەست بە بەختیاری دەکەن لە تورك بوونی خۆیان. داکۆکیشی لێدەکەن. دەڵێن نەتەوەیەك نییە ناوی کورد بێ و زمانێکیش نییە پێی بگوترێ کوردی. تەنانەت بە وانەی لە ناوەڕاست و خۆرئاوای ئانادۆڵدا دەژین دەڵێن تورك، کەچی بە کورد دەڵێن "تورکی ڕەسەن". کەواتە وەك کورد ڕەفتارکردن یاخود وەك (تورك) ڕەفتارکردن لەگەڵ نەتەوەی کورددا، بە پێی سیاسەتی سەردەمە جیاجیاکان دەگۆڕێ. هەموو ئەم سیاسەتانە تاکە یەك ئامانجی نەگۆڕیان هەیە: کۆیلەکردنی تەواوەتی نەتەوەی کورد. لە ناوبردنی کەسێتی و شەرەفی کورد، سڕینەوەی ناوی کوردو ناوی کوردستان لە زمان و مێژوودا. ئا ئەمەیە کەلە ئەفەریقادا، واتە لە کۆلۆنیالیزمی کلاسیکدا نییە، لە هندستان و خۆرهەڵاتیشدا نییە. ئەوە حۆرێکە لە پەیوەندی کە تەنها لە کوردستاندا پەیڕەوی لێدەکرێ. ئەنجامی ئەوەش کە کۆلۆنییەکی کلاسیك نییەو، ڕووبەڕووی گوشارێك بۆتەوە زۆر سەختترە لەوەی لە کۆلۆنییە کلاسیکیەکاندا هەیە، ئەمەیە:

ئەگەر کوردستان یەکێك بوایە لە کۆلۆنییە کلاسیکیەکان و، بۆ نموونە وەکو عێراق، سوریا، لوبنان و ئوردون لە بیستەکاندا وەك دەوڵەتێکی (ئینتیدابی) دابمەزرایە، ئەگەر بڵێین ئەمڕۆ "لەمێژ بوو بە سەربەخۆیی خۆی گەیشتبوو"، نابێ بە فاڵگرتنەوەو ڕەمڵ لێدان حساب بکرێ یاخود ئەگەر کوردستان بە یەکپارچەیی بدرایە بە حوکمی هەر دەوڵەتێك، تورکیا، یا عێراق (حوکمی ئینتیدابی ئینگلیزی)، یا سوریا (حوکمی ئینتیدابی فەرەنسی)، یاخود ئێران، ئەگەر بڵێین ئەمڕۆ "لەمێژ بوو بە سەربەخۆیی خۆی گەیشتبوو". دیسان نابێ بە فاڵگرتنەوە و ڕەمڵ لێدان حساب بکرێ. چونکە ئەوکاتە نەتەوەی کورد یەك دوژمنی دەبوو و چواردەوری بە دوژمن نەدەگیرا.

بەڵام کوردستان پارچە پارچە کراوە. سیاسەتی پەرتکە- زاڵ بەو دابەشکردنی ئیمپریالی کوردستان لە لایەن بەهێزترین دەوڵەتە ئیمپریالییەکانی ئەم چەرخەوە واتە ئینگلتەراو فەرەنسا، بەکاری ئایدیۆلۆجی و سیاسی عەسکەری هاوبەش لەگەڵ هاوکارەکانیان لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، واتە کەمالیستەکان و دەوڵەتی پاشایەتی ڕەزا شا، جێبەجێکراوە. ئەو دەوڵەتانەش کە کوردستانیان بە خۆیانەوە بەستۆتەوە، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باشتر کاری بە کۆلۆنیکردن بەڕێوەبەرن، لەناوبردن و کۆیلەکردنی خودێتی نەتەوەی کوردیان کردۆتە ئامانجی بنەڕەتی هاوبەش. لە ئەنجامی ئەم پارچە پارچەکردنەدا، لانی کەم چوار دوژمن بۆ خەباتی نەتەوەیی دیموکراتی نەتەوەی کورد هاتونەتە ئاراوە. هەموو داوا نەتەوەیی و دیموکراتی و تێکۆشانەکانی نەتەوەی کورد کە دژی ئەم دابەشکردنە وەستاوە، خەڵتانی خوێن کراون. دیسانەوە بە کاری ئایدیۆلۆجی سیاسی ئابووری و عەسکەری هاوبەش لێیاندراوە.

کۆلۆنیالیزمی کلاسیکی، هیچ یەکێك لەمانەی تێدا نییە. کۆلۆنی کلاسیکی، کۆلۆنیی تەنها یەك دەوڵەتە. لە کاتێکدا کوردستان لایەنی کەم کۆلۆنی چوار دەوڵەتە. لە کۆلۆنییە کلاسیکەکاندا کەسێتی ناوچەو نەتەوەی کۆلۆنی کراو ڕەت نەکراونەتەوە. لە کاتێکدا لە کوردستاندا هەموو کارو کردەوەیەك لە پێناوی سڕینەوەی ناوی کوردو ناوی کوردستان لە زمان و مێژوو بەشیاو حساب دەکرێن. بەم شێوەیە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، کوردستان لە لایەن لەشکری سەرتاپا چەکداری 4 دەوڵەتەوە داگیرکراوەو وەکو بەندیخانەی لێکراوە. هەموو ئەمانەش جیاوازی چۆنایەتین نەك چەندایەتی. ئەمە نیشانی دەدات کە ئەو کۆلۆنیەی درێژکراوەی خاکی وڵاتی کۆلۆنیال بێت، لەژێر باری هەلومەرجێکی گەلێك سەخت تردایە لە کۆلۆنی ئەوپەڕی دەریا (ماوراء البحر). بە تایبەت ئەگەر وەکو کوردستان لە دۆخی کۆلۆنییەکی نێودەوڵەتیدا بێت، باردودۆخەکە ئەوەندەی تر سەخت دەبێت خۆ ئەگەر ئایینی کۆلۆنی و کۆلۆنیالیش هەمان ئایین بێت، هەلومەرجی گەلێك سەخت تر دێنەئاراوە. لە لێکۆڵینەوەی (ململانێی دابەشکردنی ئیمپریالی لەسەر کوردستان 1915–1925)دا، بە درێژی لەسەر ئەم بابەتە ڕادەوەستین.

(بلند ئەجەویت) و (ڕەخشان ئەجەویت) لەو کەسانەن کە لە 1976دا خۆیان بە دۆستی ئەو خەڵکە نیشاندەدا کە (کۆمەڵەی گەل کۆماری)ی ساڵانی سی بە دوژمن ناوزەدی کردبوون و لە 1943دا گوللەباران دەکران.

ئەو بلند ئەجەویتەی بە توندی پەلاماری کەسێتی و شەرەفی نەتەوەی نەتەوەیی کوردی داوەو هەر دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوتبێ درێژەی بەو پەلامارە داوە، لەو گەشتەیدا کە لە سەرەتای مانگی کانوونی یەکەمی 1976دا؛ واتە لە جەژنی ڕەمەزاندا کردی بۆ ناوچەی بوومەلەرزە لێدراو، بەو زمانە لووسەی خۆی نموونەی "مرۆڤ دۆستییەکی کۆلۆنیالییانە"ی نیشاندا بلند ئەجەویتێك کە لەو کۆڕو کۆبوونەوانەدا کە حیزبەکەی لەژێر ناوی "ئاشتی و ئازادی"دا سازیدەکرد. شان بە شانی پۆلیسە پارێزەرەکانی، پارلەمانتارە دەمانچە هەڵگرەکانی و میلیتانە قامچی و زنجیر بەدەستەکانی وەکو میلیتانێکی حیزبی پەلاماری ئەو کەسانەی دەدا کە هاواریان دەکرد "ئازادی بۆ گەلان"، باسی ڕێزو شەیدایی خۆی دەکرد بەرامبەر بەو خەڵکەی کە سیاسەتێکی ئیمپریالییانەی دژی کەسێتی، زمان، کولتوورو شەرەفیان پەیڕەو دەکرد. ئەمە هەست بە شەیدایی کردنێك بوو بەرامبەر ئازارو مەینەتی کۆیلەیەتی و بێچارەیی. لە بەرنامەی هەواڵی تەلەفزیۆنیدا، قسەی لووس و ڕەفتاری پڕ لە مرۆڤ دۆستی ساختەی (ڕەخشان ئەجەویت)ێك نمایشدەکرا کە لای پۆلیس و میلیتانە زنجیرو قامچی بە دەستەکانی حیزب خەبەری لەو کەسانە دەدا کە لە کۆبوونەوەکاندا هاواریان دەکرد "ئازادی بۆ گەلان". ڕەخشان ئەجەویت دەستی ئەو پیرەژنە کوردانەی دەگرت کە یەك وشە لە زمانیان تێنەدەگەیشت، هیچ ڕێزێکی لە زمان و کولتووریان نەدەگرت و نمایشی (بەزەیی) دەنواند: وێرانی دەکردن و خۆی لەژێر باری دارو پەردوویان قوتار دەکرد. دیارە دەبێ ناشرینترین شێوەی بەزەیی ئەمە بێت، واتە بەزەیی کۆلۆنیالی.

هۆی ئەم نمایشی بەزەییەی (پ گ ك) چییە، لە کاتێکدا (پ گ ك) لە سییەکاندا کوردی بە دوژمن داناوە (دوژمنی هاوبەشی ئێران، ئینگلتەرەا، فەرەنساو تورکیا). پێش ئەو بەروارەو پاش ئەویش هەموو پێویستیەکانی ئەم دوژمنایەتیەی بە جێهێناوە، لە ساڵی 1943داو لە ڕووداوی "سی و سێ گوللە"دا دیارترین نموونەی ئەو سیاسەتەی بەدەستەوە داوەو، ئەم هەڵوێستەی لە مەسەلەی کێشەی نەتەوەی کورددا قەت نەگۆڕاوەو لە (1976)یشدا هەروەکو خۆی بەردەوام بووە؟ لە سەرەوە هەوڵماندا هۆکانی ئەمە ڕوون بکەینەوە. ئەمە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە لە سەردەمە جیاجیاکاندا چۆن ڕەفتار لەگەڵ کورددا بکرێت. ئەوکاتەی لە زیندانەکانی ئیدارەی

عەسکەریدا بە بۆمبای گازو تفەنگی ئۆتۆماتیکی پەلاماری کوردەکان دەدرێت دەنگی لێوە نایەت. ستایشی خاوەنی ئەم پەلامارانە دەکات کە گوایە "بە شەرەف" و "دادپەروەرن". بەڵام کە بوومەلەرزە دەبێ، بەزەیی کۆلۆنیالی حازرە. نابێ ئەوەش لەبیر بکرێ کە ئەم "ڕێز" و "بەزەیی" و "مرۆڤ دۆستییە کۆلۆنیالیانە"یە، پەیوەستە بەوەوە کە کوردەکان کەسێتی و کەرامەتی خۆیان ڕەتبکەنەوە، یاخود ڕەتکرانەوەی قبوڵ دەکەن، ئەوانەی داکۆکی لە کەرامەتی خۆیان و نەتەوەکەیان بکەن بە دوژمن حساب دەکرێن. هەست بە شەیدایی بۆ بە کۆیلەبوون دەکرێ.

سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێد Umut) ڕەخشان ئەجەوێت، لە ژمارەی یەکەم و دووەمی ڕۆژنامەکەدا، بیرەوەرییەکانی خۆی سەبارەت بە گەشتەکەی بۆ ناوچەی بوومەلەرزەکە، گێڕایەوە. بەم شێوەیە باسی ئەو هۆیانە دەکات کە بووبوونە هۆی خەم و پەژارەی خۆی:

".. هەندێ لە گەنجەکانی دەوروەی ناوچەکەش، واتە هی شارەکانی تر، هەندێکی شارە گەورەکانی خۆرئاوا، هاتبوون بۆ ئەوێ. هەندێکیان بە نیەتێکی پاکەوە، سەرکەوتووتر لەوەی دەوڵەت توانیبووی بیکات، هەوڵیان دەدا ئەو کەلوپەلانەی لێرەولەوێ کۆیانکردبوونەوە بەسەر خەڵکدا دابەشیکەن و بگەنە ئەو کەسانەی لە گوندەکاندا مابوونەوە. بەڵام هەندێکیش وتاری تێکدەرو هاندەرانەیان دەدا. کە ئێمە هاودەردیمان لەگەڵ خەڵکدا نیشاندەدا، ئەوان بە کۆمەڵ هاواریان دەکرد (کوردا را ئازادی)".

وەکو بینرا ڕەخشان ئەجەوێت لە دروشمی "کوردا را ئازادی" ناڕەحەت دەبێ. ترس و مەراقەکەی ئەمەیە. ئازادبوونی نەتەوەی کوردو ژیانی وەکو کۆمەڵێکی هاوچەرخ. گەیشتنی بە کەسێتی ڕەسەن و کەرامەتی خۆی. درێژەدانی بە تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی کوردی بوون. بەڵام دیارە ئاساییە ڕەخشان ئەجەوێت لە خەباتی دژە کۆلۆنیالی نەتەوەی کورد بترسێ و تووشی مەراقی بکات. وەکو هەموو کۆلۆنیالییەکی تر"[10]

ڕەخشان ئەجەوێت، سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێد) پاشتر ئەوەش ڕادەگەیەنێ کە میلیتانەکانی پارتی بزووتنەوەی نەتەوەیی (M H P) و ئەوانەی هاوار دەکەن "کوردا را ئازادی"، کارێکی هاوبەش دەکەن. وەک بلند ئەجەوێت لە کۆبوونەوەی (تاندوغان)دا گوتبووی: لەناو ئەوانەدا کە هاوار دەکەن "ئازادی بۆ گەلان". کەسانێک دەبینم کە دروشمی "بۆ کورد"یان هەڵگرتووە. ئەمە تێڕوانینێکی بێ ئەندازە هەڵەیە، تێگەیشتنێکی هەڵەیە. بەڵام بە هەڵە بینین و بە هەڵە تێگەیشتنێکی بە ئەنقەست و هۆشیارانەیە. ئەمە لە کاتێکدایە کە هیچ جۆرە لێکچوونێک نییە لە نێوان میلیتانەکانی (M H P) و ئەوانەدا کە هاواردەکەن (کوردا را ئازادی). بەڵکو دژایەتی نێوانیان ئەوەندە گەورەیە کە هیچ سازشێک هەڵناگرێ. بەڵام لە مەسەلەی کێشەی نەتەوەی کورددا، جیاوازی نێوان (پ گ ك) و (M H P) تا ڕادەی نەبوون کەمە. هەردوو حیزب بە توندی پەلاماری کەسێتی و کەرامەتی کورد دەدەن. هەردوو حیزب هەوڵدەدەن بۆ ئەوەی نەتەوەی کورد بخەنە ژێر باری ستەمی دەوڵەتی تورکەوە، یاخود کۆشش دەکەن ئەو باری ستەمەی خۆی لە بنەڕەتدا بوونی هەیە، درێژەی پێبدەن. هەردوو حیزب هەموو توانایەك بەکاردێنن بۆ ئەوەی ناوی کوردو ناوی کوردستان لە زمان و مێژوودا بسڕنەوە. هەردووکیشیان بەرزترین پلەی حیزبی دەدەن بەو کەسانەی خودو کەسێتی و کەرامەتی خۆیان ڕەتدەکەنەوەو، دەبن بە تورك و بە تورکایەتی خۆیاندا هەڵدەڵێن و سووکایەتی بە نەتەوەی کورد دەکەن. هەموو کۆششێك دەکەن بۆ بەهێزکردنی ئابووری و سیاسی تورك‌و دژایەتی نەتەوەی کورد دەکەن. هەموو کۆششێك دەکەن بۆ بەهێزکردنی ئابووری و سیاسی و ئایدیۆلۆجی ئەو جۆرە کەسانە. کە بارودۆخی بابەتی‌و کردەگی و ژیانی واقیعی بەم شێوەیە بێت، نمایشی مرۆڤ دۆستانەی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێد) ڕەخشان ئەجەوێت کە بەو زمانە لووسەی خۆی قسە دەکات، بە هیچ جۆرێك بیروبۆچوون و کارە ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیالییەکانی بەرامبەر بە نەتەوەی کورد ناشارێتەوە. ئەو دژایەتیەی لە نێوان ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەو نەتەوەی کورددا هەیە، سازش هەڵناگرێ. بەڵام دژایەتی نێوان (پ گ ك) و (M H P) لە مەسەلەی کێشەی نەتەوەی کورددا، بە هیچ جۆرێك شازش هەڵنەگر نییە. لە هەموو ساتێکدا دەتوانن یەکبگرن و دژی کورد ڕێکبکەون. بە هەمان شێوەش سەرۆکی گشتی (پ گ ك) بلند ئەجەوێت و سەرۆکی گشتی (M H P)، (ئالپ ئاسلان تورکەش)، لە بابەت فاکتی نەتەوەی کوردەوە هیچ جیاوازییەکیان لە نێواندا نییە بیروبۆچوون و کردەوەکانیان وەك یەکن. نابێ بڵێن: "چۆن ئەجەویتی ئازادیخواز لەگەڵ(ئالپ ئاسلان دەبێ؟"، بەڵکو دەبێ لە ژیانی واقیعیدا سەرنجی ئەم تێڕوانینە بدەن. هەردوو سەرکردە لەم مەسەلەیەدا چی دەڵێن، چۆن ڕەفتار دەکەن، لە مەسەلەی تورکەکانی دەرەوەی تورکیاشدا چی دەڵێن و.. هتد:

".. خەڵکی ناوچەکە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەوڵەت و ڕوناکبیرەکان نە و زەحمەتەیان بەخۆیان نەداوە فێری تورکییەکی ڕاست و ڕەوانیان بکەن. بەلام تەنانەت لەو ڕۆژە پڕ لە ئازارانەشدا پەیوەست بوونی خۆیان بە میللەت و دەوڵەت و نیشتمانەوە ئاشکرا دەکرد. ئەو ڕۆژە هەموو خەڵك پشتیان دەکردە ئەوانەی لە (مورادیە) بە کۆمەڵ هاواریان دەکرد (کوردا را ئازادی).

خەڵکی ئەو ناوچەیەش، لە شەڕی ڕزگاریدا شەهیدیان داوە، لە هەڵمەتی ئاشتی قوبروسدا (مەبەست داگیرکردنی باکووری قوبروسە لە لایەن لەشکری تورکەوە –20ی تەمووزی 1974) شەهیدیان داوە. هەر ئۆتۆمبێلێکی ئاڵای سوور هەڵگر بە ڕێگاکانی خۆرهەڵاتدا بڕۆیشتایە، خەڵکی ناوچەکە، کە لەبەر نەبوونی خوێندن و فێرکردن زۆربەیان هێشتا فێری تورکی نەبوون، وەکو منداڵ بە پێوە ڕادەوەستان و سەلامیان بۆ دەکرد.

هەمیشە خزمەتی دەوڵەتیان کردووە. بەڵام سەدان ساڵە ژیانیان نەگۆڕاوە. نێستاش هەر تەنها هیوایان بە دەوڵەتەکەیان بوو. یەکەم قسەیان ئەمە بوو (خوا لە دەوڵەت و میللەت رازی بێت).. لە ڕقی ئەوانەی خۆیان سەر بە میللەت نازانن، دووبارە خۆیان دەخزاندەوە باوەشی میللەت"[11].

سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێد) بە ڕوونی و بە شانازییەوە، گەوهەر (جەوهەر)ی کۆلۆنیال و ڕەگەزپەرستانەی خۆی ئاشکرا دەکات. هەر لە بنەڕەتدا هەوڵی شاردنەوەی لە ئارادا نییە. بۆچی دەبێ نەتەوەی کورد فێری تورکی بکرێت؟ بۆچی گەشە بە زمانی کوردی نادرێت؟ مانای وایە ئێوە دەبێ لە لایەکەوە ببنە ڕووناکبیر، لە لایەکی تریشەوە نابێ دژی پەلاماری ڕەگەزپەرستە کۆلۆنیالییە ئیمپریالییەکان بۆ سەر نەتەوەی کوردو زمان و کولتووری کوردی، ڕاوەستن، تەنها بۆ خزمەتی ئەم سیاسەتە دەبێ فێری تورکی ببن. ئایا سەرنووسەری (ئومێد) لەو جۆرە "ڕووناکبیر"انەوە فێری تورکی بووە؟ بۆچی دەیەوێ ئەم دۆخە (فێربوونی تورکی) کە مافی سروشتی خۆیەتی وەك ئیمتیازێك لە قەڵەم بداو بەسەر نەتەوەی کوردیدا بسەپێنێ؟ ئەو قسەیەی ڕەخشان ئەجەوێت کە دەڵێ نەتەوەی کورد لە دروشمی "کوردا را ئازادی" ناڕەحەت دەبوو، تێبینی کردنێکی هەڵەو تێگەشتنێکی هەڵەیە. ئەمە ئاواتی خاوەنەکانی سیاسەتی ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیال و ئیمپریالیە. دەمێنێتەوە سەر ئەوەی کە تەنانەت ئەگەر بۆ ساتێکیش ئەم دۆخە بە ڕاست وەربگرین، ئەرکی کەسێکی دیموکرات و ڕۆشنبیر ئەوەیە بڵێت ئازادی شتێکی باشەو نابێ دژی ڕابوەستێ ئەرکی هاندانی داواکارییەکانە بۆ ئازادی. ئەو کەسەی بە ڕاستی دیموکرات بە ڕاستی ڕۆشنبیربێ، تەنها بەوەندە وازناهێنێ لە پێناوی ئازادی نەتەوەی خۆیدا خەبات بکات. پێویستە لە سەری هاوڕێی خەباتی ئەو نەتەوەیەش بێت کە هەوڵی بە کۆیلەکردنی دەدرێ‌و، ڕووبەڕووی گوشاری ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیال و ئیمپریالیستانە بۆتەوەو، زمان و کولتوورو کەسێتی و کەرامەت و شەرەفی زەوتکراوە. لە گەوهەری دیموکرات

بووندا ئەم ڕەخنەیە هەیە. کەسێك کە بە ڕاستی دیموکرات و بە ڕاستی ڕۆشنبیر بێت هەست بە شەرمەزاری دەکات بەرامبەر بەو گوشارانەی بورجوزای خۆی دەیانخاتە سەر نەتەوەکانی تر. پیاهەڵدانی ئەوانەو هاندانی ئەو جۆرە گوشارو پەلامارانە، ئیشی خاوەن گوشارەکان. دەمامکی (ئازادی)، (یەکسانی). (دیموکراسی ئادیخوان) و (چەپی دیموکراتی) کردن بۆ ئەو بیرۆبۆچوون و کردارانە، ڕەفتارێکی ناشیرین و شوورەییە.

ڕەخشان ئەجەویت "ئازایەتی دەنوێنێ"، دان بە ڕاستیەکدا دەنێ و ئەو سیاسەتە بەرامبەر بە کورد دووبارە دەکاتەوە کە ماوەی پتر لە (50) ساڵە دەوڵەتی تورك بەرامبەر کوردستان و نەتەوەی کورد درێژەی پێدەدا. ڕاستە کوردەکان لە شەڕی سەربەخۆییدا نێردراون بۆ بەرە جۆربەجۆرەکان و لە داگیرکردنی قوبرسدا بەکارهێنراون. بەڵام گرنگ ئەوەیە دەستنیشانی بکەین پاش ئەو ڕووداوانە چییان دەسکەوتووە؟ پێشتر گوتوویانە کە (ئیتحادو تەرەقی) و (قوای میللیەچی) و کەمالیستەکان، بە دروشمی "ئەگەر شەڕی ئەرمەن و فەرەنسییەکان نەکەن. کوردستان دەبێتە ئەرمەنستان". هەستی نەتەوایەتی کوردیان لە بەرژەوەندی خۆیان بەکارهێناوە. لە کۆتاییدا چی ڕوویدا؟ نەتەوەی کورد هەڵخەڵەتێنرا. زمانی دایك و کەسێتی و شەرەفی زەوتکرا. بە هاوکاریکردن لەگەڵ ئینگلتەرەی ئیمپریالی و فەرەنسای ئیمپریالیدا، کوردستان پارچە پارچە کرا. بە وەحشی ترین شێوە، سیاسەتی "پەرتکە-زاڵ بە" دژی نەتەوەی کورد پیادەکرا. ناموسی نەتەوەی کورد زەوتکرا.

دیارە ئەوەش ڕاستییەکی زانراوە کە لە شەڕی نەتەوەی چەوسێنەردا، نەتەوە کۆلۆنی کراوو کۆیلەکراوەکان دەنێردرێن بۆ ڕیزی هەرە پێشەوەی بەرەکانی شەڕ یەکێك لە گرنگترین ئەو سیاسەتانەی سوڵتان عەبدولحەمید بۆ درێژەپێدانی دەسەڵاتی ئیمپراتۆری عوسمانی بەکاری دەهێنا، بریتی بوو لە پێکدادانی کوردو ئەرمەن. بەم شێوەیە باڵادەستی عوسمانیەکان بەسەر ئەم نەتەوانەدا دەستەبەر دەکرا. زۆر سروشتییە سەرەك وەزیر بلند ئەجەویتیش لە داگیرکردنی قوبرسدا، کورد بنێرێتە ڕیزی هەرە پێشەوەی شەڕو شەڕەکە بخاتە نێوان کوردو ڕۆمەوە. جیاوازی نێوان ئەو سیاسەتەی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم و سیاسەتی بلند ئەجەویت، زۆر کەمترە لەوەی بە بیردا دێت. بەڵام چۆن ئەرمەنیەکان زۆر چاك بەم سیاسەتەی عوسمانییەکانیان دەزانی، ئاواش ڕۆمەکان بەم سیاسەتە بە ئاوەڕۆك ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیالی و ئیمپریالییەی بلند ئەجەویت دەزانن. زۆر بە باشی سیفەتی کۆنەپەرست، کۆلۆنیالی، ڕەگەزپەرست و داگیرکەرانەی ئەو هێزە دەناسن کە لە داگیرکردنی قوبرسدا، کوردی دەنارده ڕیزی هەرە پێشەوەی شەڕو لە گەڵیاندا بە شەڕی دەدان.

پێشتر گوتوومانە ئەگەر شێوەکانی پیادەکردنی کۆلۆنیالیزم لە جیهاندا پلەبەندی بکرێت کۆلۆنیالیزمی تورکی لە کوردستاندا دەچێتە پلەی یەکەمەوە. سەرەڕای هەموو ئەوە هەوڵەکانی دەوڵەت بۆ سەپاندنی زمان و کولتووری و تورکی بەسەر نەتەوەی کورددا، سەرەڕای سیاسەتەکانی پەروەردەو فێرکردنی ئیشتمانیو، ئەو قوتابخانە سەرەتاییە ناوخۆییانەی دەوڵەت کە ناوەندەکانی لەشکری ئینکیشاری[*] بە بیردێننەوە، سەرەڕای جەندرمەو تانك و بۆمباو قامچی و تفەنگ بە دەستەکان و، هۆکانی ڕاگەیاندنی گشتی کە هەموو ڕۆژێك برێك زیاتر بەرفراوان دەبن، هێشتا دەڵێن "..

لەبەرئەوەش کە کەس نەبووە فێری تورکییان کات..". بە ڕاستی کۆلۆنیالیزم سیستەمێکە گەورەترین دوژمنی بەهاو نرخی مرۆڤە. نمایشکردنی مرۆڤدۆستی و بەزەیی کۆلۆنیالیانەش دەمامکێکن بۆ ئەم دوژمنایەتیە.

ڕۆژنامەی (ئومێد) کە ڕەخشان ئەجەویت سەرنووسەری بووە، پڕە لە ریکلامەکانی بانکی ئیش. ژمارە دووی بەرواری 15ی کانوونی یەکەمی 1976ی ڕۆژنامەی ناوبراو ئاگادارێکی بەم شێوەیەی تێدایە:

"بێ هودە نی‌یە
بێ‌هودە نی‌یە
کۆبونەوەی پتر لە پێنج ملیۆن هاووڵاتی
لەژێر چەتری بانکی ئیشدا
بەو حسابەکراوانەی
کردوویانەتەوە
..ڕاکردنی زیاتر لە پێنج ملیۆن خاوەنی حساب
بەرەو بانکی ئیش بێ هوودە نی‌یە.
بێ‌هودە نی‌یە
ئەوەندە متمانە.. ئەوەندە خۆشەویستی
ئێوەش
خۆتان بەوان بگەیەنن
بۆ دڵنیابوونتان
بۆ سبەینێی دڵنیاتان
بانکی ئیشی تورکیا"



..ڕونکردنەوەیەکیش سەبارەت بە (پ گ ك)
"ئەمڕۆ سەرمایەی بانکی ئیشی تورکیا
%11.61 ی بۆ خەزێنەیە
%27.57ی بەو شێوەیەی لە سەرەوە باسکراوە بۆ (پ گ ك)یە.
%32.85ی وەقفی خانەشین کردن و یارمەتیدانی فەرمانبەرانی بانکی ئیشکراوە
%27.97یشی هی کەسانی تایبەتی و یاساییە"[12].

"ئەم حەقیقەتەی (پ گ ك)یش کە لە سەرەوە باسکرا، بەم جۆرە ڕووندەکرێتەوە: وەکو زانراوە (وەك چۆن ڕاستی مەسەلەکە تەواو نەزانراوە)، پاش کۆچکردنی ئاتاتورك، بە پێی وەسێتنامەکەی خۆی سەهمەکانی دراوە بە پارتی گەلی کۆماری و زێدە (فائض) کانیشی دراوە بە دەزگای مێژووی تورك کە هەر خۆی دایمەزراندووە"[13].

"..کەواتە بۆ تێگەیشتن لە (پ گ ك)ی ئەمڕۆ، تەنها بینینی ئاگاداری و ئیعلانەکانی (ئۆزگورئینسان Ozgur Insan) کافی نیە. بەڵکو مێژووی کۆمەڵایەتی (پ گ ك)یش بریتییە لە مێژووی گەیاندنی بۆرجوازی خۆماڵی تورکی بە سیاسەتی پارەی سەرمایەداری لە ڕێگەی (دەوڵەت)ەوەو سەرەڕای هەموو ئەو گۆڕانانەی دەڵێن بەسەر (پ گ ك)دا هاتووە (پ گ ك)ی ئەمڕۆش تا ئەبەد جێپەنجەی ئەم (گوناهی یەکەم)ەی هەر پێوە دەمێنێ"[14].

Turk Hava Yollari (هێڵی ئاسمانی تورکیا) Gima. Hayat Mutfak Nabati Margarini.

Cukobirlik Sigorta, Taris. Toz.

Deterjan, Mikki Piyango. Emek Otelleri. Turizm Bankasi, A.S.Sport Toto (Sizde Oynarin

Umit Edin, Kazanin). Petrol Ofisi. Tarakiua Birlik Gemel Mudurlugu, Tansa Tanzim Satislari.

Anadolu Sigorta.

گومـانی تێـدا نیـە ئـەم ئاگـاداری و ئیعلانانـە لـــە بەرامبـــەر کرێیـــەکی دیاریکراودا لـە ڕۆژنامـەی (ئومێـد)دا دابـەزێنراون. پەیوەندیـەکانی (ڕەخشـان ئەجـەویت)ی خـــاوەنی ڕۆژنامـــەی ئومێـــد لەگـــەڵ بانکـــەکان و بەڕێوەبـــەرە گشتیەکاندا، بەهۆی ئەم ئاگادارییانەوە، بووە بە هۆی دەنگدانێکی پەرلـەمان لەسەر سەندنەوەی متمانە لە حکومەت. لەو داوانامەیەدا کە لەلایەن (ئەرۆل یاشیل پنار)ی پەرلەمانتاری سەر بە (پارتی عەدالەت AP) و نۆ هاوڕێی تریەوە پێشکەشـکراوە، ئیدیعـا دەکـرێ کـە ڕەخشـان ئەجـەویت بـە بـەکارهێنانی کاریگـەری سیاسـی و ئیـداری سـەرۆک وەزیـر بلنـد ئەجـەویت، بانکـەکان و بەڕێوەبەرێتییە گشتیەکانی ناچـار کـردووە بـایی ملیۆنـەها لـیرە ئاگـاداری و پڕوپاگەندەو کرێی ئابوونە بدەن بە ڕۆژنامەی ئومێد.

لـەو عەریزەیـەدا ڕادەیەگەیـەنرێ کـە ڕۆژنامـەی ئومێـد لـە سـاڵی 1977دا (91000) لیرەی تورکی پارەی ئاگاداری و ریکلامی وەرگرتووە. لە ساڵی 1978دا ئـەم پارەیـە گەیشـتۆتە (1875000) لـیرەی تورکـی. هـەروەها دەگوتـرێ ئەگـەر سـەرنجی مـانگی کـانوونی یەکـەمی سـاڵی 1978یـش بـدرێ، ئـەم ژمارەیـە گەیشتۆتە دوو ملیۆن لیرەی تورکی. ئەگەر ئابوونەی دەزگا ڕەسمییەکانیشی بچێتـە سـەر، کرێیـەکی (2600000) دوو ملیـۆن و شـەش سـەد هـەزار لـیرەیی دەردەچێت، بۆ ئاگاداری و ڕێکلام و ئابوونە. لـە عەریزەکـەدا بەرزبوونـەوەی ئەو پارەیەی لە ئاگاداری و ریکلام و ئابوونەوە دەستکەوتووە بەستراوەتەوە بە دەسـەڵات گرتنـە دەسـتی (پ گ ك) وە. (بڕوانە: میللیەت و ڕۆژنامـەکانی تـر، 21ی کانوونی یەکەمی 1978. هەروەها بڕوانە: دەوڵەت Devlet، ژ – 9 کانوونی دووەمی 1979، ل 38039).

لەکاتی پێشکەشکردنی ئەم عەریزەیەدا، ڕۆژنامـەی ئومێد ژمارەی (56)ی بـەرواری 15ی کانوونی یەکـەمی 1978 خـۆی دەرکردووە. پاش ئەمە بینرا کـە دەرچوونی ڕۆژنامەکە وەستێنرا.

سەرەڕای هەموو ئەمانە، جێگەی سەرنجە ئەو دەزگایانەی کە ئاگاداری و ڕێکلامەکانیان وەرگیراوەو ئابوونە کـراون، بریتـین لـە بانکـە جۆربـەجۆرەکانی دەوڵەت و بە ڕێوەبەرێتییە گشتییەکانی سەر بە وەزارەتەکان.

سیاسـەتمەدارانی (پ گ ك) ڕەخشـان ئـە جـەویت و بلنـد ئەجـەویت، کـە ڕۆژنامەکانیان پڕە لە ریکلامی بانکی ئیش و پەیوەندییەکی ئاوا بەرفراوانیان لەگەڵ بۆرجوازی گەورەدا هەیە، گوایە هاودەردی لەگەڵ ئەو کوردە هەژارانـەدا دەکەن، کە ماڵەکانیان بە سەریاندا ڕووخاوە.

بلند ئەجەویت سەرۆکی گشتی (پ گ ك) لە نێوان 5–8ی کانوونی دووەمی 1977دا، سـەردانی بولگارسـتانی کـرد. یـەکێك لـە گرنگگـترین هۆکـانی سەردانەکەیشی بریتـی بـوو لـە گرنگیـدان بـە کێشـەکانی ئـەو تورکانـەی لـە بولگارسـتان دەژیـن. بلنـد ئەجـەویت لـە کۆنگـرە ڕۆژنامـەوانیو وتـارە جۆربەجۆرەکانیدا لە پەرلەمان، بە دوورو درێژی باسی ئەو کێشانەی کرد. لـە هەواڵـەکانی بـەرواری (13ی کـانوونی دووەمـی 977)ی ڕادیـۆ تەلـەفزیۆندا، بەشی زۆری ئەو وتارانە بڵاوکراونەتەوە، لە چاپەمەنیدا دەرچوون. بۆ نموونە هەواڵی ڕۆژنامەی (ئومێد) بەم شێوەیەیە:

" . گرنگترین کێشەی تورك ڕەگەزەکان بریتییە لەو مەسەلانەی پەیوەستن بە زمان و کولتوری تورکییەوەو لەم مەسەلانەشدا باسی هەموو وردەکارییەکان کرا

ئەجەویت بەم جۆرە ئەنجامەکەی ئاشکرا کرد:

ڕامانگەیاند کە بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی دەکەین لە ئەگەری یارمەتیدانی ڕەوتی زیاتر سوودوەرگرتنی تورکەکان لە یەکسانی و بەو شێوەیەش بوونیان بە هاووڵاتی لە بولگارستاندا. بەڵام لە پاڵ ئەمەشدا ئەو ئاسانکاریانەی بـۆ ئـەوەی ئـوێ دەکرێـن بـۆ فـێربوونی زمـانی تورکـی بـە ئـەندازەی پێویسـت، پەیوەندیـە دۆسـتایەتیەکانی نێـوان دوو وڵات زۆر بـەهێز دەکـەنو، مـیراتی کولتوری هاوبەشیان تەندروست ترین بناغەیە بۆ پەیوەندیەکانی نێوانمان. بە پێی ئـەوەی خـۆم چاودێرم کـردووە، باسـی هـەندێ کـەموکوڕی و کـرداری خواروخێچم کرد."[15].

بلنـد ئەجـەویت سـەرۆکی گشـتی (پ گ ك) لـەکاتی پڕوپاگـەندەکانی هـەڵبژاردنی 1977دا، لـە وتـارێکدا لـە (ئەدرنـە) دیسـانەوە بـە حەماسـەتێکی زۆرەوە ئەم مەسەلەی دووبارە کردۆتەوە:

" لەم بارودۆخەدا تورکیا وایلێهاتووە چیتر لە هیچ مەسەلەیەکدا هەست بە قورسایی خۆی ناکات. ئەتەوەی تورکیش ناتوانێ داکۆکی لە تورکەکانی ناو وڵاتانی تر بکات.

لەبەرئەوەیە کە ئـەم حکومەتـەی خـۆی بـە (نەتـەوەیی) نیشـاندەدا، گوێـی خۆی لە مەسەلەی تورکەکانی بولگارستاندا خستووە.

لـە بەرامبـەر کێشـەکانی تورکـەکانی یۆنـان و عێراقدا، بێخەمـە (لامبـالات). ئەوانەی خەیاڵ لە ئاسیای ناوەڕاست دەکەنەوە، خۆیان لە دەنگی تورکـەکانی پەناگوێمان کەڕدەکەن. ئەوانەی باسـی تورکیـای گـەورە دەکـەن. بچووکـترین یارمـەتی ئـەو تورکانـە نـادەن کـە بـۆ مافـە ئینسـانیەکانی خۆیـان، چـاوی هیوایان بڕیوەتە تورکیا.

(پ گ ك) لە ئۆپۆزسیۆنیشدا بووبێت داکۆکی لە مافی تورکەکانی وڵاتانی تر کردووە. ئاشتی و ئازادی بۆ تورکەکانی قوبرس هێناوە"[16].

ئەم وتارانە نیشانیدەدەن کە سەرۆکی گشتی (پ گ ك) بلنـد ئەجەویت، لـە نزیکەوە گرنگیدەدات بە بارودۆخ و کێشەی تورکەکانی ناو بولگاریا. سەرۆکی گشـتی (پ گ ك) بلنـد ئەجـەویت، هـەوڵدەدات بـەم هەڵوێسـتەی، سـۆزی ڕای گشتی تورکی بۆ خۆی کۆبکاتەوە. هەوڵدەدات لە ڕێگەی گرنگیدان بە کێشـەی کۆمەڵـە تورکییـەکانی دەرەوەی تورکیـاوە، نەتـەوەیی بوونـی حیزبەکـەی بسەلمێنێو بەم شێوەیەش لە هەڵبژاردنەکاندا زیادبوونی دەنگی بۆ مسۆگەر بکات: ئا لێرەدا دەگەینە خاڵێکی گرنگی تر. وەکو لە لێکۆڵینەوەی (میتۆدی زانسـتی و پیـادەکردنی لـە تورکیـادا I– بـە زۆر ئیشـتەجێکردنی کـورد)دا نیشـانماندا، سـەرۆکی گشـتی (پ گ ك) بـۆ بەدەسـتهێنانی دەنگـی تـر لـە هەڵبژاردنەکاندا، ڕێگەیەکی تریشی دەگرتە بەر ئەویش ئەو ڕێگەیەیە کە لە (خۆرهـەڵات)دا بەکاریـهێناوە. سـەرۆکی گشـتی (پ گ ك) بلنـد ئەجـەویت. ئاوا دەڵێت:

"بە ئیرادەو بە گوڕێکی پۆڵاینەوە بەرامبـەر ئـەو کەسـانە ڕاوەسـتاین کـە دەڵێن ئازادی بۆ گەلان. چەندین جار بێنـەوەی بێزارو ماندوو بین، گوتمان لە تورکیادا تـەنیاو تـەنیا نەتـەوەی تـورك دەژی. ئەوانـەش کە دەڵێن (ئازادی بـۆ گەلان) سیخوڕی دەستی بێگانەن. لە هەموو جێیەك دەنگەکانمان زیادیکرد".

سەرۆکی گشتی (پ گ ك) بلند ئەجەویت، زۆر بە ڕوونی قسە دەکات لە کاتێکدا کـە داکۆکـی لـە مافـەکانی (کۆمەڵـەی تورکـی بـوون) بـۆ تورکـەکانی دەرەوەی تورکیا دەکات، مافەکانی (کۆمەڵگەی کوردی بوون) بۆ کوردەکانی نـاو تورکیا، بێ چەندوچوون ڕەتدەکاتـەوە. وتاری (ئۆرهان ئەیوب ئوغلـو)ی سـکرتێری گشـتی (پ گ ك)، کـە لـە بەرنامـەی هـەواڵی هـەڵبژاردنی ڕادیـۆو تەلـەفزیۆندا لـە 17ی نیسـانی 1977دا داوێتـی لـەو ڕووەوە کـە لەگـەڵ بـیرو کردەوەی سەرۆکی گشتیدا یەك دەگرێتەوە، زۆر سەرنجڕاکێشە. ئەیوب ئوغلو ئاوای دەگوت:

".. حیزبی عەدالەت (AP)، لەبەرئەوەی متمانەی بە ڕێکخستنەکانی خۆی نییـە، لـە گـەلێك شـاردا ئاوەندەکـانی خـۆی دەخاتـە ژێـر چـاودێری و پشکنینەوە".

ئورهان ئەیوب ئۆغلو، سکرتێری گشتی (پ گ ك) پاش ئـەوەی یـەك هـەزار کەس مەیدانی (تەقسیم)یان پڕکردبوو، بە دەنگی بەرز دروشمی جۆربەجۆریان دەگوت، ئـەو هاووڵاتی و کرێکارانـەی بەشداری کۆبوونەوەکـەیان دەکـرد، لـە

شێوەی چەند قۆڵی ڕێپێوانێکدا دەهاتنە مەیدانەکە، کە هاواریان دەکرد "ئازادی بۆ کورد" و گوتی: (لەو جێگەیەی باسی ئازادی تورك هاتە پێشەوە، باسکردنی ئازادی کەسێکی تر جێگەی نابێتەوە. هەر ئێستا بێدەنگ بن. ئەگەر بێدەنگ نەبن، بە یارمەتی هێزەکانی ئاسایش لە مەیدانەکە دەرتاندەکەین".

وەکو بینرا قسەکانی عەلی تۆپز لە ساڵی 1978دا، لە ڕووی چۆنایەتییەوە هیچ جیاوازیەکی نییە لەگەڵ قسەی (مەحمود ئەسعەد بۆزکورت)ی وەزیری داد، لە ساڵی 1930دا: کورد هەرگیز ئازاد نابێت هەمیشە دیلی دەستی تورك دەبێ. کورد تەنها بۆی هەیە لە پێناوی ئازادی تورکدا شەڕبکات.

ئەو ڕێگایانەی (پ گ ك) بۆ زیادکردنی دەنگەکانی لە "خۆرهەلات"دا دۆزیونیەوە ئەمانەن. لە کات و شوێنێکدا کە زانکۆ تورکییەکان ئاوا "ئازانستی" و "چەپ"ی تورك و بزووتنەوەی "سۆسیالیست"ی تورکی ئاوا کەمالیست و، ئەوانەش کە پێیان دەڵێن "نوێنەرانی خۆرهەلات" ئەوەندە بێکەرامەت و بێ کەسێتی (بێ شەخسیەت) بن زۆر سروشتییە ناوی ئەو بیروبۆچوون و کردەوانەی (پ گ ك) بکرێت بە "چەپی دیموکراتی"، "یەکسانی"، "ئازادی"، "دیموکراسی ئازادیخواز"، "سۆسیالیست ئەنتەرناسیونال".. هتد. بەلام هۆشیاری سیاسی ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبوون و پەرەسەندنی نەتەوەی کورد، بێگومان ئەم دژایەتیە شیکار دەکات. هەموو چەپەلی، ئازانستی، دوژمنایەتیەکانی ئازادی، یەك لە دوای یەك ئاشکرا دەکات.

بەم جۆرە هەڵبژاردنی گشتی 1977، وەڵامێکی گرنگ بوو بۆ ئەو بنیاکییانەی (پ گ ك). هەرچەندە کە (پ گ ك) لە ئۆپۆزیسیۆندا بووە، بەلام لە خۆرهەلاتدا دەنگی لە دەستداوە. با سەرنجێکی ئەم ژمارانە بدەین.

| | هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پیران 1973 | هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران 1977 |
|---|---|---|
| بینگۆلز | 27.5 | 25.4 |
| دیاربەکر | 40.00 | 38.4 |
| ئەلازیغ | 29.7 | 28.8 |
| تۆنجەلی | 84.3 | 66.3 |
| ئۆرفە | 36.0 | 33.7 |

(سەرچاوە: ئەنجامەکانی هەڵبژاردنی نوێنەران و پیرانی کۆمار، D I E، ئەنقەرە 1974، ل 6–25 بۆ هەڵبژاردنەکانی 1977 بڕوانە: ئەو ژمارانەی لە ئەنجومەنی بالای هەڵبژاردنەوە وەرگیراون. Resmi Gezete، 1977/6/19، ژ 15971)

جگە لەوە لە شارەکانی (ئاگری و موش)یش کەمبوونەوەی دەنگ هەیە.

| | هەڵبژاردنی نوێنەران 1973 | هەڵبژاردنی نوێنەران 1977 |
|---|---|---|
| ئاگری | 15.5 | 12.4 |
| موش | 17.3 | 16.5 |

(سەرچاوە: بلاوکراوەکانی سەرەوە)

**پەراوێزەکان:**

1–سەبارەت بە دیدارو گفتوگۆکانی وەزیری دەرەوەی تورکیاو چین-یش، دەتوانین کەم تا زۆر هەمان شت بڵێین. (واتە میللیەت. 1978/6/13).

2-Yeni Ulus. 3 Ocal 1977, 5.3

3–گەورەرە بالیۆز (ڕیدڤان بەی ئوغلو خەسرەو گەرەدە). پاش ئەوەی ئەم ئەرکەی خۆی بە سەرکەوتوویی بە ئەنجامگەیاندووە، لە ساڵی 1935دا، لە لایەن پێشەوای مەزن (غازی مستەفا کەمال)ەوە، کراوە بە نوێنەری (سیواس)

لە سەرەتای بەشی دووەمی کتێبی سیی و سێ گوللەدا، زانیاری چڕوپڕمان سەبارەت بە کەسێتی سیاسی و ئایدیۆلۆجی (خەسرەو گەرەدە) پێشکەشکردووە.

4–نابێ ئەوە لەبیر بکرێت کە گەورە باڵیۆزەکان نوێنەری دەوڵەتن لە پەیوەندییەکانی دەرەوەداو بە نوێنەرایەتی دەڵەت و سەرەك کۆمار کاردەکەن، لە سالانی 1930یشدا، دەوڵەت بریتییە لە (پ گ ك).

5-Halk. Iste Belge. Sayı 3.25 Haziran 1973, S. 1 18, Ayrica bk. Cumhuriyet. Yeni Ortam Milliye Haziran 1973

6–ئەم ڕووداوە کە لە (2)ی مارتی 1973دا ڕوویداوە، بە خۆی و هۆو ئەنجامەکانیەوە، لە هەندی عەریزەدا بە درێژی باسکراوە لە دوا نامەی تەمیزی هەندێ لە هاوڕێیاندا کە (510) لاپەڕە دەبێت و نێردراوە بۆ دادگای تەمیزی عەسکەری (ل 39 و دوایی) هەروەها لە دوا نامەی (ڕاستکردنەوەی بڕیاری) خۆمدا کە ڕۆژی (1977/3/26) ناردووەمە بۆ دادگای تەمیزی عەسکەری. زانیاری چڕوپڕ سەبارەت بەو ڕووداوە هەیە. هەروەها بڕوانە:

Mehmet Emin Bozarslan, Icerdekiler. Disardekiler, Koral Yayin Evi, Istanbul 1974, S. 9-91

7 BK. Hamdi Sevinc (Hakım Albay). Toplım Hukule yonetılır, Cumhuriyet 10 cak 197

Hamdi Sevinc (Hakım Albay). Onderin Gosterdigı yol, Cumhuriyet, 3 Mart 1978.

ئاسایش و ئاسوودەیی. جێگەی سەرنجە کە بۆردومانکردنی کوردستانی باشووری ناوچەکانی شەمدینلی بە بۆمبای ناپاڵم لەلایەن ڕژێمی ڕەگەزپەرست و کۆلۆنیالی بەعسەوە. لەو ساتەوەختەدا ڕوویداوە کە سەرەك وەزیر بلند ئەجەویت پێشنیاری دۆستایەتی نوێی پێشکەشی ئێران و عێراق کردووە، بۆ چارەسەرکردنی کێشە هاوبەشەکانی (کێشەی کورد).

بڕوانە:

YENI Asir, Tuzak, Doguyu Koparmak Istiyorlar, 2-12 Temmaz 1978, Milliyet, 18 Temmuz 1978 Aydilik. 26 Haziran 1978.

10–لێرەدا باس لەوە نییە کە ئایا بەرزکردنەوەی دروشمی "کوردا ڕا ئازادی" لە شوێنی خۆیدا بووە یان نە. دەمانەوێ ئەو مەراق و ناناسوودەیی و ترسە دەربخەین، کە سەرنووسەری ڕۆژنامەی (ئومێد) ڕەخشان ئەجەویت بەرامبەر بەم دروشمە هەستی پێدەکات.

*(MHP): واتە حیزبی بزووتنەوەی نەتەوەیی.

*ئالای سوور: مەبەست ئالای تورکیایە.

11-Rahsan Ecevit, ayni yazi.

*ئینکیشار: سەربازی پیادەی لەشکری عوسمانی کە لە ساڵی (1362)دا لە لایەن (ئورهان غازی)یەوە دامەزرا. منداڵان کۆدەکرانەوەو لە ناوەندێکی تایبەتیدا پەروەردە دەکران بۆ ئەوەی ببنە سەربازی پیادەی لەشکری عوسمانی

12-Turkye Is Bankası 50 Yıll S. 84. Sozeden. Sedat Ozkol.

Programi: Ak Gunlerin ((Safagi)) Ozguluk yolu. Sayi 20. Ocak 1977 S. 40.

13-Turkiye Is Bankasl. 50, yil. S 84. Sozeden Sedat Ozkol. a.g yazı, S. 40

14-Sedat Ozkol, a.g.y. S. 40-41

ژمارەکانی دواتری ڕۆژنامەی (ئومێد) پڕن لە ئاگادارییەکانی ئەم دەزگایانەی خوارەوە:

Tukiye Is Bankas (بانکی ئیشی تورکیا), Denizcilik Bankasi (بانکی دەریاوانی) Ziraat Bankası (بانکی کشتوکاڵی). Tukiye Halk Bankasi (بانکی گەلی تورکیا) Vakiflar Bankasi

15-Umut. Sayi 4, 15 Ocal 1977. S3

16-Hurriyet. 18 Nisan 1977

**سەرچاوە: سیو س گوللە.**
**وەرگێڕانی: ئاسۆس هەردی**

# بزوتنەوەی پێشکەوتنخوازی کوردو چەپی عێراقی

وەرگێرانی: شەیدا

دەربارەی بزوتنەوەی کورد لە عێراقدا، د.تاریق زیاد ئەکنجی نووسیویە: ئەو بزووتنەوە کوردییە عێراقییە لەجەوهەردا دیموکراسی و دژە ئیمپریالیزمەو پشتیوانی لە برایەتی گەلان دەکا (1) لەبەرئەوەی ئەم



بزوتنەوەیە دژە ئیمپریال و دیموکراسییە بۆیە خاوەن سیماو پێناسەی پێشکەوتنخوازانەیە هەروەها لە ناوەڕۆک و جەوهەریشدا. گەلێک مافە نەتەوەییەکانی پێشێل کرابن بەشێوەیەکی تر نابێ بێدەنگ بێت.

تاماوەیەکی درێژ چەپی عێراقی لە سروشتی پێشکەوتنخوازانەی بزوتنەوەی کورد حاڵی نەدەبوون، بەڵکو هەر نەیدەویسترا لێی حاڵی بێ ئەوەش بووە مایەی خولقاندنی کەشێکی ئاڵۆز چ بۆ چەپی عێراقی بەگشتی و چ بۆ بزوتنەوەی کورد.

لێرەدا ئەوەی گرنگە زانستیانە مەسەلەکان تاووتوێ بکرێن، ڕوانین و هەڵوێستی زانستیانەش بەر لە هەرشتێک لێکدانەوەی زانستی بارە بابەتیە دیاریکراوەکان دەخوازێ. بەڵام بارە بابەتیەکە دەکاتە تەواوی ئەو بونیادە جودایانەی کۆمەڵگە پێک دەهێنن و پاشان پەیوەندی نێوان ئەو بونیادانەو ڕەنگدانەوەی ئەو پەیوەندییانە لەسەر یەکە یەکە هەبووەکان. بەڵام لێکدانەوەی ئەو دۆخە بابەتیە دیاریکراوانە دەکاتە چی؟ دەکاتەوە گەڕان بەنێو پەیوەندییە دینامیکیە ناوەکیەکانی کۆمەڵگە. بەواتایەکی تر هەبوونی پەیوەندی تەواو لە نێو بونیادە کۆمەڵایەتیەکاندا. ئەگەر لەو گۆشەنیگایەوە بۆ دیاردەکە بڕوانرێ ئەوکاتە لەناو جۆراو جۆری هۆکارەکاندا دەرئەکەوێ بزوتنەوەیەکی نەتەوەیی لە پێشکەوتندایە بەتایبەتی لەژێر فشارو چەوساندنەوەی شۆڤێنی ناو عەرەبدا هەر بۆیە ئەو بزوتنەوەیە پاڵپشت بەکۆمەڵێ داخوازی کە پشتیوانیان لێدەکا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، چڕدەبێتەوەو گەشە دەکا چونکە لەجەوهەردا پێشکەوتنخوازە.

بەڵام ناوەندێتی دەسەڵات لەگەڵ ئەوەی لافی چەپڕەوێتی لێئەدا، لەگەڵ ئەوە زۆر بێهودە دەتوانێ کۆنتڕۆڵی ئەو بزوتنەوە لە پەرتی بکا. بەڵام هێزی دینامیکی ناوەوەی کۆمەڵگەی کوردی لە باکوری عێراق بایی ئەوەندەیە بتوانێ لەو هێزو گوشارانە تێپەڕێنێ کە لە نێوەندی دەسەڵاتەوە ڕووی تێدەکەن.

لەبەر ئەو هۆیانە لەناوەوەی بونیادی ناوەندی دەسەڵاتدا کودەتای حکومەتی سەرهەڵئەدا هەر وەک شیاوی ئاماژەیە کودەتا بەرو دواسەربازییەکانی نێو حکومەت لەدوای ساڵی 1958- وە ئاکامی ڕێکەوتێک نەبوون بەڵکو بۆماوەیی و پیادەکردنی چەپە شۆڤێنیە تەقلیدیەکانی عێراق بووە، ئەوە لە سروشتیدا زەمینەی خولقاندووە کە عێراق کاربکاو گوشاربخاتە سەر مافی گەلی کورد. ئەو کارەش بووە مایەی کۆکردنەوەی هێزەکانی سەربازی حکومەتی عێراق دژی کورد. هەر بۆ نمونەو لە کەمترین پێوانەو لێکدانەوەدا سەد هەزار شەڕکەر دژی ڕاپەڕینی کورد بەکار بهێنێ.

بەتەنها تێچوی ئەو جەنگە بووە ئاکامی دابەزینی ئاستی ئابوری کە ئەوەش بووە مایەی هەوڵی کودەتای دەستەیەکی چاو لە دوبۆدەسەڵات. لەژێر کاریگەری ئەوانەو بارودۆخەکەدا دەسەڵاتی ناوەندی لاواز بوو.. دەستەی تازە دەسەڵات بەدەست گرتووش جارێکی دی هەوڵیدا ڕێگا چارەیەک بۆ مەسەلەی کورد بدۆزێتەوە لەوێوە زنجیرەیەک لە وتووێژ پێکەیشتن ئەنجامدرا. بەڵام تەقلیدی شۆڤێنی وایکرد لەبنچینەوە کێشەکە وەک خۆی بمێنێتەوە بۆیە تێکۆشان و خەبات سەری هەڵدایەوە ئیتر لەو ئاکامەشدا زەمینە خۆشبوو بۆ کودەتایەکی نوێ بەو جۆرە ئەو هەڵوێستەی چەپ لەو ماوەیەدا وەریگرت زۆر گرنگە. دوای ڕوخانی قاسم، بارزانی بەچەپەکان دەڵێ: (ئێوە ناچارن بۆ پشتیوانی کردن لە بزوتنەوەکەمان ئەگەر بەهاوسۆزی یاهاتنە ناو ریزی پێشمەرگە بن. ئەوەش مەرجێکە بۆ گەشەکردنی بزوتنەوەی چەپ لە عێراق و هەروەها کورت بونەوەی

ماوەی سەرکەوتن لەلایەن بزوتنەوەی کوردایەتیەوە خۆ ئەگەر ڕەدی ئەم پشتیوانیەتان داینەوە ئەوا ئێوەش بەرهێرش دەکەون و بەهۆیەوە دوبارە دۆزی کورد دوا دەکەوێ، بەڵام چەپی عێراقی لەئاست ئەو وریاکردنەوەو داوایەدا چ بایەخێکیان نەداو نزیک نەکەوتنەوە بارزانی گوتەنی (خراپترین لێدانیان تێ سرەوێنراو چەشتیان)

مارکسیەکان لەسەردەمی دەسەڵاتی عارفدا ژیاون ئەویش کە دەسەڵاتی گرتە دەست. وەک چەپێک خۆی ئاشکرا کرد، ئەوان سەری دنیایان لێ هاتەوەیەک خۆ ئەگەر بیانتوانیایە بەرەیەکی هاوبەش لەگەڵ بزوتنەوەی پێشکەوتنخوازی پێک بهێنن بەواتایەکی تر ئەگەر تەقلیدی شۆڤێنی ئەوەستاباو یەک ریزنەبان ئەوابەر ئەو لێدانە نەدەکەوتن و دۆزی پێشکەوتنخوازی بزوتنەوەی کوردیش دوانەدەکەوت. هەر لەبنەمای بەیانی یانزەی ئازاری 1970دا دیارە کە بزوتنەوەی پێشکەوتنخوازی کورد بەهیچ جۆرێک لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندیدا هاتنە پێشەوەو دانوسانی قەبوڵ نەکردووە. ئەو مافانەش کە گەلی کورد بەدەستی هێنا ئاکامی ئەو بەرەنگاربونەوە بێ پشوو بێ پسانەوەیە بوو کە نەرمی نواندنی قبوڵ نەکردووە بۆیە ئەوە بەخشینێک نییە لە دەسەڵاتی مەرکەزیەوە بێگومان بزوتنەوەی کورد، وەک لێرەدا هەوڵ ئەدەین ڕوونی بکەینەوە ئەو بزوتنەوەیە چ ئاقاری پێشکەتن و هەروەها لەجەوهەردا بزوتنەوەیەکی پێشکەوتنخوازانەیە گەشەکردن و پێشکەوتنیشی لە ئاکامی پەیوەندییان بووە بەتەواوی بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی دژ بە ئیمپریالیستی جیهانی. لەهەمان کاتدا لەو جەنگەیاندا دوورو سەربەخۆبون لە کاریگەرێتی و دەستێوەردانی وڵاتانی گەورە. کورد یاریدەی ئەمریکایان پێنەگەیشتووە، وەکو نوسەرە پێشەوتنخوازەکانی ئیدعای دەکەن هەروەها لە سۆڤیتیەکانیش وەک نووسەرە بۆرژواکان دەڵێن.

ئەو چەکانەی بەکارهێنراون لە چەکی سوک و زیاتر بەپێی پێداویستیەکانی شەڕی پارتیزانی لەناوخۆدا پەیداکراون، لەو چەکانەی کە سەربازانی سوپای عێراقی لەدوی خۆیان جێ‌ی هێشتوون، یا ئەوسەربازە کوردانەی بەچەکی خۆیانەوە پەیوەندییان بە بزووتنەوەکەوە کردووە، ئەوی کراویشە بەپێی توانای دارایی ڕەخساوی بزوتنەکەبووە پاشان گەلێکی دەست کورت لە هەموو توانایەکی بەرەنگاربونەوە دژی دەسەڵاتێکی کە هەر ئەو بزووتنەوەیە بەرەنگار بونەوەی لە ئەستۆ گرتووە.

بۆیە قبوڵ کرنی پشتیوانی لەهەر وڵاتێک مایەی خۆ بەمعڵەدا بردن و نامۆبوون نییە. دوای رێکەوتنی ئازاری 1970 ڕۆشتر جەوهەری پێشکەوتنخوازانەی بزوتنەوەی کورد دەرکەوت و وەک پێشتر ئەمایەوە ئەو دەربڕینەی بارزانی و تەواوی سەرکردەکانی کورد ((سەبارەت بە هەڵوێستی دژ بە چەوساندنەوەی دەرەبەگی)). هەروەها لەگەڵ حکومەتە عێراقیەکاندا لە هێڵی هاوتەریب دابوو بۆ دژایەتی کردنی ئیمپریالیزم و ناردنی دەستەیەک کە لە (1500) پێشمەرگە پێک هاتبوون بۆ روسیا تا لەبواری زانستی پزیشکی و ئەندازیاریدا زانیاری وەربگرن.

هەروەها پاڵپشتی کردنی بەرەی رزگاریخوازی فەلەستینی بە هەزار پشتیوانی پێشمەرگە ئەوانە لەبەرچاوە بابەتیەکانن بۆ ئەو پێشکەوتنە.

سەرچاوە:

النظام في الاناضول الشرقية، ص 177-180

# شێوازە دژێومکانی دەسەڵاتی مەرکەزی بەرامبەر بە گەلی کورد

رۆژار کوردوەنی بە کوردی

شۆڕش واتە ڕاپەڕین بۆ گۆڕانکاری لە نێو بونیادی پەیوەندی کۆمەڵایەتی و بەرهەمهێناندا ئیتر ئەوە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا بێ دەبێ بۆ بەرژەوەندی جەماوەر بێ و گۆڕانکاریش لەو ڕێتمانەدا بکا کە هێزی سیاسی بەپێی دەسەڵاتدارێتی حوکم پشتی پێ بەستووە. شۆڕشی 1923 بڕگەی یەکەمی ئەسەلماند. بەڵام بڕگەی دووی گەیاندە ئەنجام ئەمە لە کاتێکدا هیچ جوداییەک لە نێوان سەردەمی کۆماری و سەردەمی عوسمانیدا بەدیارنەکەوت سەبارەت بە گۆڕانکاریی لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنانا، ئەگەر دامەزراوێکی سەرخانی کۆمەڵ بەرەو ڕەی گۆڕانی ڕیشەیی بێتەوە وەک ئەوە لە سەرچاوەی سەرەکی توانای سیاسیەوە هاتەپێش، ئەمە لە کاتێکا نوێنەری دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەتی عوسمانی کە مەبەستم پادشایە دەسەڵاتی حوکمی لە (خوا، قورئان، خیلافەت) وەردەگرت

سەرۆکی کۆماری تورکیا ڕاستەوخۆ توانای دەسەڵاتی لە گەلەوە بوو نەک لە سەرچاوە ئاینییەکانەوە ئەم عیلمانیەتەش لە دیندا شۆڕشە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو شۆڕشە دەسکەوتی پوختەی گۆڕانکاری نەبوو لە پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان کە بنەماو دەسەڵاتی خۆی دەچەسپێنێ، ئەمە بووە مایەی خوڵقاندنی تەنگژەی زۆرو گەورە[1]

لە مادەی 38ی پەیمانی لۆزاندا بە مێژوی 23ی تەموزی ساڵی 1923 ئەمە هاتووە "حکومەتی تورکیا بەڵێنی پاراستنی سەربەستی بێ کەموکوڕی هەموو هاووڵاتیانی تورکیا ئەدا ئەمە بە چاوپۆشیکردن لە ڕەگەزو زمان و شوێنی لە دایک بوون و ئاین" بەڵام لە مادەی (39)ی بەندەکانی هەمان پەیماندا هاتووە: (نابێ هیچ ئاستەنگێک لە بەردەم پاشکۆ تورکەکان دابنرێ لە پەیوەندییە تایبەتی و ئاینییەکاندا هەروەها ئەم بڕیارەش بێ سانۆر هەموو جۆری چاپکراوو پەخشنامەو کۆبوونەوەو دیمانەکان دەگرێتەوە ئیتر بەهەر زمانێک بێت لەگەڵ ئەوەی زمانی تورکی زمانی ئاخاوتنی ڕەسمییە بەڵام پاشکۆ تورکەکان لەوانەی بە زمانی دایک ئەدوێن بۆیان هەیە لە بەرزکردنەوەی داواکانیاندا بە زمانی خۆیان بپەیڤن هەروەکو بەپێی تواناش کار ئاسانییان بۆ دەکرێ)[3]. هەروەک لە بەندی (40)ی پەیماننامەی ناوبراودا هاتووە (پاشکۆ تورکەکان سود لە کەمایەتیەکانی تر وەردەگرن سەبارەت بە پرۆسەی بیمەو مامەڵە وەک مافە چەسپێنراوەکان، پاشکۆ تورکەکان هەمان مافیان هەیە لە پیادەکردنی پرۆسە دینی و کۆمەڵایەتیەکاندا ئیتر سەر بەهەر ڕێکخراوێکی خێرخوازی بن بە مەرجێ و بە تایبەت کە ئەوان بەرپرسی کارگێڕی و خەرجی و چاودێریان لەسەر هەر بوارێکی فێربوون و فێرکردن هەبێ ئیتر تەواوی سەربەستیان هەیە لە زمان و بۆنە ئاینیەکاندا)[2] وەک ئاشکرار لەبەرچاوە چ لەو مێزگردانەی کاتی بەستنی کۆنگرەی (لۆزان) یا دۆکۆمێنتەکانی کۆنگرەی پێشوتر، کۆمار (جمهوریت) لەسەرەتای ساڵەکانی حوکمدارێتیدا سیاسەتی بەرچاوو ڕونی هەبوو بە وشەی (کورد) و (کوردستان). لە کۆبوونەوە ڕەسمیەکاندا بیرۆکەی دەرکردن و ترساندن تەنانەت لە پێکهاتەی نەتەوەیی تورکیادا وەک لە بەشی پێشوتری باسەکەی (ئەحمەد ئوغلو) داهاتووە

سەبارەت بە ئاقارە سیاسیەکانی ئیمپراتۆریتی تورکی کە مافەکانی نەتەوەکانی تری پێشێل نەکردووەو لەبەرئەوەی باوەڕی بە یەکسانی نەتەوەکان هەبوو بەڵام ئەو هەڵوێستە دوای هاتنە پێشی حوکمی کۆماری زۆری نەخایاند بە تایبەت بزوتنەوەکانی یاخیبون و شاڵاوی دورخستنەوەو ئاوارەبوون لە سایەی ئەو سیاسەتەوە گەشەی کردو سەریهەڵدا یان ئاشکراتر بڵێین بەهۆی ئەو بزوتنەوانەوە ڕەوتی سیاسی تۆختر مایەوە. ئیدی قسەو باسێك سەبارەت بە کوردو مافە نەتەوەییەکانی نەما، بەڵکو شاڵاوی پروپاگەندە وایان ڕادەگەیاند "کوردان تورکن" ئەوجا هەوڵی گوشار درا بۆ سەر زمان و داب و کەلتوری کورد لە کاتێکا وەك لە پەیماننامەی (لۆزان)دا هاتووە و پێشتر باسی لێوە کرا، لەوێدا ئەوان دانیان بە مافی نەتەوەیی کوردا ناوە وەك کەمینەیەك. بەڵام ڕۆم و ئەرمەن و یەهود سودمەندتر بون لەو مافانە هەتا کوردان لە تورکیا بگرە کوردان بە چەوساوەیی مانەوەو کەسێ دانی بە مافی نەتەوەییاندا نەنەناو لە زۆر لاوە دەچەوسێنرایەوەو پەنا دەبرایە بەر جۆرەها شێوازی گوشار بە تایبەتی زانکۆ. ئەو سیاسەتە توندە پیادە دەکا وەك ڕەوایی دانێك بە گوشارو چەوساندنەوە.

لەو کۆبوونەوانە لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتی ڕێکدەخران. زانست و فێربوون دەکرانە بەهانەو هۆیەك بە دەست و قاچێکەوە پێڕەو دەکرا، پرۆفیسۆر (بەسیم دارکوت) کە لە سێ هەفتانە کۆڕی زانکۆییدا لە نێوان ماوەی 23–30 ئەیلولی 1942دا لە (ئەزیخ) قسەی کردووە، دەڵێ: (کە لە دەرسیمیەك دەپرسن لە کوێوە هاتووە؟ دەڵێ لە (خۆراسان) هەموو خەڵکێکی دەرسیم شانازی بە ڕەچەڵەکی خۆیانەوە دەکەن کەسێکیان دودڵ نیە لەوەی کە سەر بە (ئەحمەد ئەلیەسەوی) بێ لە کاتێکدا (خۆراسان) ڕۆڵێکی لە بەرچاوی گێڕاوە لە مێژوی تورکا بە تایبەت بۆ ئەوانەی لە خۆرهەڵاتەوە دەچوونە خۆرئاوا[4]. ئەحمەد ئەلیەسەوی لە سۆفیەکی گەورە زیاتر نیە. لە تورکستانی خۆرئاوا لە دایکبووە ئیتر هەموو ئەوانەی لەوێبون لە سەردەمی عوسمانیدا بە کورد ئێوزەدە کراون. بەڵام دەرسیمیەکان ئەبونەتە کورد لەبەرئەوەی کوردن وەلێ لەبەر زۆری ئێوزەدەکردنیان بە کورد، وایلێهات ڕونبێتەوە کوردن ئێستاش با لەم کوڕەداو بۆ یەکەمجار دەستەواژەی کورد وەربگرین و ئیستێکی بۆ دەکەین، لە ئاماری ڕەسمی ساڵی 1935دا ملیۆن و نیوێك لەو هاووڵاتیانەی بە زمانی کوردی ئەدوێن تۆمارکراون. لەبەرئەوەی زمانی کوردی زمانی دایکە، بڕوانە ئەوە چییە کە پێی دەگوترێ کورد؟ ئەمە دەکاتە چی، ملیۆن و نیوێك بەو ناوەوە تۆمار کراون؟ داخۆ لەوەدا کفرێك هەیە؟ لە کاتێکا ئەوەمان قبوڵ بووە ملیۆن و نیوێك خەڵك بە پێشچاومانەوە وا ناونووس بکرێن. بەڵام با جارێ ئیستێك بکەین و پەلەمان نەبێ، ئەوانەی بەو زمانە دەدوێن بەلاوەیان دەنێین. لە ڕاستیدا ئەم خاڵە توێژینەوەی زانستیانەی ڕاستەقینەی دەوێ، با چاوەڕوانی ئاکامی لێکۆڵینەوەکان بین بەڵام ئاکاتە ئەوەی دودڵ بین لە ئاست هەندێ ئامارەدا کە هەن. ئەو حاڵی بوونە لەوەی بە زمانی یەکگرتوی کوردی ناسێنراون نەك بە کۆمارێکی کوردی، ئەوە چ زیانێك بە یەکێتی نەتەوەییمان ناگەیەنێ بەڵکو هەڵەیەو پوچەڵە، لە ئەنادۆڵی خۆرهەڵاتدا ئەو زمانە تاقانە نیە بگرە ئەوانەی بە شێوە زارە جیاجیاکان ئەدوێن کە هەریەکەیان لە زمانی تورکییەوە نزیکترە ئەوەندەی ئەو بەو بەوی تر نزیك دەبێ، ئەمە وا دەکا بوەستین و بە ڕۆشنی ڕونی بکەینەوە، ئەکادیمیای ڕوسیای قەیسەری فەرهەنگێکی کوردی بە (8000) هەشت هەزار وشە ئامادەکرد دەڵێن زیاتر لە 36٪ لە تورکیەوە هاتووە ئەوی ماوەتەوە بەشێکی بەر زمانی فارسی دەکەوێ پاش ئەوە 30٪ زمانی فارسی ڕۆڵی خۆی لە بوارەکەدا ئەبینێ ئەوی دەمێنێ لە نێوان ئەرمەنی و عەرەبدان پاش ئەوان زمانی تورکی لە بەرچاوو زاڵە لە کاتێکا زۆرینەی ئەو دەستەواژانەی بەکاری دێنن تێکەڵەیە لە بەکارهاتووەکانی زمانی عەرەبی و گەلێك لە دەستەواژەی فارسییە هەر ئەوانەن لە زمانی تورکیدا بەکاردەهێنرێن، ڕاستتر زمانی تورکی گوێزراوەتەوە بۆ کوردی.

ئەگەرچی ئەو فەرهەنگە بۆتە پشتیوانێك بەڵام لە هەمان کاتدا متمانە کردن لەسەری کارێکی زۆر شیاو نیە، هەروەکو لە سەرەوە ڕونکرایەوە چونکە لە یەك ناوچەی جوگرافیدا تاکە زمانی چەسپاو ئەوە کارێکە گومانی لێدەکرێ.

ئەو گوتانە پوختەی هەڵوێست و ڕوانینی سیاسیانەی شۆڕشن بەرامبەر بە کورد. لەوە بگەڕێ کە پرۆفیسۆر کورد نیە، وێڕای ئەوە دەیەوێ وای بخاتە بەرچاو کە هەر کەسێك کورد بوو ئیتر ئەوە بەشێکە لە خوێنڕێژی و شەرەف شکێنی، پێم وایە پێویست بە هیچ بە دواداچونێك ناکا هەڵوێستی وا هەڵقوڵاوی باری سۆزن نەك بە زانست پشت بەستووبن.

بەر لە هەر شتێك ڕوانینی زانستیانە پشت بەستنە بە شیکردنەوەی زەرفە دەستنیشانکراوەکە. هەروەکو بەرەو ڕوبونەوەی ئەو زەرفە دەستنیشانکراوە بە تورەیی و بوقی پڕەپاگەندەو فوتێکردنی دەسەڵات ئەنجام نادات بە دەستەوە. ئەمانە تێکڕا مەسەلەیەکن پێچەوانەی کاری زانستی هەروەکو زەمینەیەکیش لەبەر دەم کۆمەڵگەدا خۆش دەکا کە ئاکامەکەی قورسە.

لە پاڵ زانکۆ دامەزراوەکاندا بۆقە تورکییەکان کاریان بۆ ئەوە دەکرد بیسەلمێنن کوردان تورکن هەروەکو کۆشش و هەوڵی بەردەوام دەدرا تا جەماوەری میللی پشتیوانی لێبکەن. ئەو بۆقە میللیانەی پاڵپشتە بە تواندنەوەی کوردو هەبونی نەتەوەییان لەوە نە دەسەلمێنەوە ئەو کتێبانە تەرجەمە بکەن کە تایبەتن بە کورد ئەویش بە مەبەستی شێواندنی ڕەسەنێتی نەتەوەییان، ئەو کتێبانەی لەلایەن بۆقە تورکیەکانەوە دوای ساڵی (1925) تەرجەمە کراون بەڵام دواتر ڕێگەی دابەشکردنی نەدرا ئەمانەن:

1–هەواڵە هاتووەکان لە سەرچاوە عەرەبیەکانەوە دەربارەی کورد (شێواندنێکە لە لایەن قادری بەگ)

2–زانستە هاتووەکان لە دایەرەی مەعاریفی ڕوسی سەبارەت بە ئەرمەن و کوردو نیشتەجێکانی ڕۆژهەڵات بە گشتی و شارە کوردییەکان بە تایبەتی.

3–زانیاریە وەرگیراوەکان لە یەکەمی هەر دوو کتێبی ناونراو بە (ئەرمینیای کۆن و ئەمڕۆ) دەربارەی کورد.

4–زانیاریەکان لە کتێبی دووەمی ناونراو بە (ئەرمینیای کۆن و ئەمڕۆ) دەربارەی کورد.

5–بابەتی کوردستان لە دائیرەی مەعاریفی بەریتانیادا.

6–بابەتێکی ئەرمینی لە دائیرەی مەعاریفی Broknouz.

7–ئەو بەشەی کە تایبەتە بە سۆمەرییەکان لە کتێبی ناونراو بە (عەجەم) کە دوو بەرگە.

8–ئەو بەشەی کە تایبەتە بە کورد لە کتێبی ناونراو بە (نەتەوەکانی ئاسیاو ئەوروپا).

9–ئەو هەواڵانەی سەرچاوەیان دەگەڕێتەوە بۆ نیشتەجێ بووانی ڕۆژهەڵات لە کتێبی (ڕۆژهەڵاتی نزیك).

10–بەشێکی تایبەت بە کوردو ویلایەتی ڕۆژهەڵات لە کتێبی ناونراو بە (نیشتمانی تورك) لە Klinkard.

11–هەواڵە وەرگیراوەکان لە نامەکانی (نون فولتکە) کە تایبەتن بە کورد.

12–نەخشەی ڕێگەوبان لە ئەرمینیاو کوردستان.

13–کتێبی ناونراو بە (دوو ساڵ لە کوردستان).

14–بڵاوکراوەکانی (بوغوس نوبار پاشا) دەربارەی کوردو ئەرمەن و ویلایەتی ڕۆژهەڵات.

15–زانیاریە وەرگیراوەکان لە کتێبی (چاکسازی لە تورکیا)دا دەربارەی کوردو ئەرمەن.

17-بەشی یەکەم لە کتێبی ناونراو بە (لێکۆڵینەوە دەربارەی کورد) بە زمانی ئینگلیزی.

18-کتێبی ناونراو (بە جلوبەرگی ڕووپۆشەوە لە جزیرەو کوردستان).

19-ئەو کتێبەی نزیکەی زیاتر لە دوو سەد لاپەڕەیە زانیاری گرنگی تیایە سەبارەت بە ڕەچەڵەکی کوردو زمانەکەیان. لەوێدا کۆمەڵێك لێکۆڵینەوە کە لەلایەن پروفیسۆر (ئافت ئینان)ەوە نووسراون ئەوی شیاوی سەرنجە ئەوە دواڕاکردن و خۆ بە هەڵەدا بردنە سەبارەت بە شیکردنەوەی زمانە دەستنیشانکراوەکان. ئەو لە کتێبەکەیدا تەواو پێچەوانەی بیرو ئایدۆلۆژیای دەسەڵاتی سیاسی کردووە، هەر بۆ نمونە لە کۆتایی توێژینەوەکەیدا لێکدانەوەیەکی زۆر بە پێچەوانەی ڕاستییەکانی کردووە: (لەوەی باسکرا ئەگەر هۆزەکانی تر بە تورك ناونرابن مەبەستمان لەوە بوو یەك ڕەگەزیی تورکان بخەینە ڕوو ئەو هۆزانەش لازو کوردن. ئێمەش ئەوەمان بە شێوەیەك نوسیوە کە پەیوەستە بە دەرکەوتی ناوچەی جوگرافیاییەوە لەو بەڵگانەی کە بەراورد کراون کە تورك یەك ڕەچەڵەك و ڕەگەزە)[5].

بێگومان ئافت ئینان یەکێکە لەو ئایدۆلۆژیستە بەرچاوانەی کە بە ئاشکرا نکۆڵی لە هەبوونی کورد دەکەن، ئەمەشی بەسەر زانکۆکاندا تێپەڕاندووە بەبێ هیچ ڕوویەکی ڕاستی و تەفسیکی زانستی[6]. جگە لەوە لۆردکینرۆز- ئەویش توێژینەوەیەکی دەربارەی ئەتاتورك هەیە بەڵام لە هاتنە پێشەوەی ناوی کورددا شتی زۆر دوور لە ڕاستی زانستییەوە درکاندووەو پڕیەتی لە ناکۆکی، کینرۆز دەڵێ: کوردەکان کەمینەیەکن لە سۆفییەکان وەك ڕەگەزو زمان لە تورکان جیاوازن بەڵکو ئەوان وابەستەی دەرەبەگەکانن و بە هەوای ئەوان هەڵدەسوڕێن پاشان سەریەشەو کێشە بۆ حکومەتی عوسمانی دروست ئەکەن(7).

**پەراوێزەکان:**

1-لەبەرئەوەی کەمالییەکان دوای جمهوریەت بەدوای گۆڕانی بونیادیی نەکەوتن وەك چارەسازی زەوی و شتی لەو بابەتە، لەبەر هۆکاری جیاواز، نەڵبەت دەتوانین بەشێك لەوە لە یادداشتەکانی (صبیحە سرتل)دا بخوێنینەوە (بەرەو ڕۆمان) لە بڵاوکراوەکانی ئانت، ئەستەنبوڵ 1999 لە لاپەڕە (67) بە دواوە. لە لایەکی ترەوە دەبینین (مهری بللی) لەو نوسینەیدا کە بەناونیشانی (دژە شۆڕش لە تورکیادا) چەپی تورك ژمارە (64) (4) شوباتی 1969، لە لاپەڕە (67) بەدواوە، ئەم هۆکارانە دەهێنینە پێش:

-ئەو کاتانە دانیشتوان یانزە ملیۆن بوون لەناو تورکیادا ئێستا گەیشتۆتە سی‌و سێ ملیۆن؛ یانزە ملیۆن نەبۆتە مایەیەك بۆ داواکردنی زەوی و شتی وا لە ئارادا نەبووەو هەست بە بون نەکراوە.

2-بازاڕی جیهانی بۆ نرخی گەنم لە دابەزیندا بوو ئەمەش بۆ کڕیارانی بووە مایەی تێکشکان، ئالیەتی دادوەریش بە شێنەییەکی زۆر کارناسانی دەکرد بۆ بەکارهێنانی زەوی، ئەمەش لە بەرژەوەندی گوندنشینان و دژی خاوەن زەویەکان بوو، ئەو داوایانەش سەبارەت بە بەکارهێنانی زەوی بەرز دەکرانەوە بایی ئەوەیە دوای ساڵانێکی دوورو درێژ ئەوە یەکلایی بکرێتەوە هەروەکو لەلایەکی ترەوە کتێبی (ئەمین تورك ئیلجی) کە بەناونیشانی (ئایدۆلۆژیەتی شۆڕشی کەمالیزم)، بڵاوکراوەکانی ئانت، ئەستەنبوڵ 1970) لەوەشدا چەند ڕوانینێکی سەرنج ڕاکێش خراوەتەڕوو.

2-جەمیل بیرسل، لوزان بەرگی دوو، ئەستەنبوڵ 1933، لاپەڕەکانی 593-594.

3-بڕواننە جەلال بایار، منیش هەروەها پاشکۆیەکم بەناوی بەدواداچوونێك بۆ تێکۆشانی نەتەوەیی نوسیوە بەسەرچاوەکانی بەرگی (2) ئەستەنبوڵ 1966 لاپەڕەی 31 بەرگی (3) 1980، 1982، بەرگی چوارەم ئەستەنبوڵ 1967 بەرگی پێنجەم ئەستەنبوڵ 1967 لاپەڕەکانی 1473، 1484، 1493، 1494، 1666، 1658، 1673، 1666، بەرگی شەش، ئەستەنبوڵ 1968 لاپەڕەی (1878)- 1994-5035) بەرگی حەوتەم ساڵی 1969 لاپەڕە (2211).

4-چەند ڕوانینێکی جوگرافیاییانە بۆ تونچلی، سێ هەفتە گوتاری گزانکۆیی (بسیم دارکوت لە ئەلازیخ ئەنقەرە 1943 ل 119-120.

5-خیر الله صبحی، ڕێگای شاخ، دوو کتێب "لە زنجیرە کتێب"ە تایبەتەکان ژمارە دوو ئەنقەرە 1931، ل 24، 25.

6-ئافت ئینان سیفەتە ئەنترۆبۆلۆژیەکانی گەل تورك و مێژوی تورکیا، ئەنادۆڵ ئیشتمانی ڕەگەزی تورکانە، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی مێژوویی تورك، ئەنقەرە 1947 ل 1881.

7-ئافت ئینان، زانیاریە مەدەنیەکان و دەستخەتەکانی کەمال ئەتاتورك، بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی مێژوویی تورکی: ئەنقەرە 1969، ل 18 و بەدوایدا 351 بە دویدا.

8-لوردکینرۆز، ئەتاتورك لە دایکبوونی نەتەوەیەك سەرلەنوێ، دەزگای پەخشی سحاندار.

سەرچاوە:

**النظام في الاناضول الشرقية**، ص 177-180



# نامەیەکی بێشکچی بۆ ڕێکخراوی (ڕای ئازادی) ئەمەریکایی

کۆمەڵناس و ڕۆشنبیری تورک ئیسماعیل بێشکچی کە ناسراوە بە دۆستایەتی و پشتگیری کردنی گەلی کورد بەهۆی ئەم هەڵوێستەوە گەلێک لە ساڵەکانی تەمەنی خۆی لە زینداندا بەسەر بردووە. لە ساڵی 1993 دا ئەم کۆمەڵناسە ڕاستگۆو مرۆڤ پەروەرە لاپەڕەیەکی تری سەروەری خستە سەر لاپەڕەی سەروەرییەکانی ژیانی. دوای ئەوەی کەوا خەڵاتی مادیی (ڕای ئازاد) کە بەهاکەی (10) هەزار دۆلارەو لەلایەن ڕێکخراوی ڕای ئازادی ئەمەریکییەوە دەدرێت بەو نووسەرو ڕۆشنفکرانەی کە بەهۆی دەربڕینی بیروڕای سەربەستی خۆیان دوچاری فشارو زوڵم و زۆری دەوڵەت دەبن ڕەت کردەوە، ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی کەوا ئەم ڕێکخراوە ئەمەریکییەو ئەمەریکاش بەهەموو شێوەیەک هاریکاری‌و پشتگیری دەوڵەتی تورک دەکات و چاوپۆشی دەکات لەو هەموو قەتل و عام و زوڵم و زۆرو پێشێل کردنی مافی مرۆڤە کە دەرهەق بە گەلی کورد دەکرێت لەبەر ئەوە ڕازی نابێت ئەو مەبلەغە پارەیە وەربگرێت و بەنامەیەک هۆیەکانی ئەم ڕەتکردنەوەیە ڕوون دەکاتەوە.

**بەشێک لە نامەکەی بێشکچی بۆ ڕەتکردنەوەی خەڵاتی ڕای ئازاد**

کوردستان وڵاتێکە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی و لە دەمی شەڕەکانی (ئەرمەن–تورک) و (یۆنان– تورک) دا پارچە پارچەکرا. هۆی ئەم پارچە کردنەی خاکی کوردستان و نەتەوەی کورد دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی داگیرکەران و ئیمپریالیزم بەتایبەتی ساڵانی (1915–1925) کوردستانیان دوچاری شالاوێکی درندانەی پارچەکردن کردووە، ئەوەی گومانی تێدا نیە ئەم سیاسەتی (پەرتکەو زاڵبە) سیاسەتێکی کۆنی داگیرکەران و ئیمپریالیزمە. ڕۆڵی مەزنی پارچەکردنی کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ ئیمپریالیزمی فەرەنسی و ئینگلیزی هەروەها لەم سیاسەتەیاندا دەوڵەتە بەکرێگیراوەکانی ناوچەکە یارمەتیان دان کە کەمالیستەکان بەپلەی یەکەمی ئەو بەکرێگیراوانە دێ و دوای ئەویش دەوڵەتی فارس و دەوڵەتە عەرەبییەکان دێن، هەوڵی داگیرکەران بۆ پارچەکردنی کوردستان بەگەورەترین ڕووداوی مێژوویی دەژمێردرێت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کەمالیستەکان لە دەوروبەری ساڵانی 1919دا بەشێوەیەکی زۆر بەرفراوان لەم پێناوە واتە پارچەکردنی کوردستان یارمەتی دەوڵەتەکانی ئینگلیزو فەرەنسایان دا، ئەم پارچەبوونە هۆی چارەسەر نەکردن و مانەوەی کێشەی کوردە بە هەڵواسراوی تا ئێستا، دابەشکردنی کوردستان سەرچاوەی هەموو گیروگرفتەکانی کوردەو هۆی سەرەکییە بۆ هەبوون و قووت بوونەوەی کێشەی کورد لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا، دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان هەر شێوازێکی فشارکردن بەکاردێنن بۆ ڕێگەگرتن لە بەدواداچوون و شیکردنەوەی ئەم شێوازە داگیرکارییە بەڕێگاو پەیڕەوێکی زانستیانە هەر لەبەر ئەوەشە پارچەکردنی کوردستان و دواتریش دابەشکردنی لە نێوان ئەم دەوڵەتانە (عێراق، سوریا، تورکیا، ئێران) بەرەشترین و تاریکترین قۆناغەکانی مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دادەنرێت.

بۆچی سیاسەتی (پەرتکەو زاڵبە) لەسەر گەلی کورد پیادەکرا؟ ئەنجامی پیادەکردنی ئەم سیاسەتە چی بوو؟ ئەو گەلەی کە دەبێتە جێگای پیادەکردنی ئەم سیاسەتە دەبێ خاڵی لاوازی زۆر مەزنی هەبێ.. باشە ئەو خاڵە لاوازانە چی بوو؟ پێویستە ئەم خاڵانە ڕوون بکرێنەوە. سیاسەتی (پەرتکەو زاڵبە) مێشکی میللەت تێک دەدات و هەموو مێشکی داگیر دەکات. هەر میللەتێک ئەم سیاسەتەی بەسەردا بسەپێنرێت زەحمەتە لە داهاتوودا بتوانێ وا بە ئاسانی خۆی کۆ بکاتەوەو هێزی خۆی بکات بەیەک، بۆ ئەوەی جارێکی تر لەسەر پێیان ڕابوەستێ، بەڵێ! ڕەوشی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەم شێوەیەیە.

سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەی کورد لە 30 ملیۆن کەس زیاترە، کەچی تا ئێستا خاوەنی ناسنامەی سیاسی نین، دوای شەڕی جیهانی یەکەم، دوو پەیمان مۆرکران کە لە نزیکەوە پەیوەندییان بە مێژووی گەلی کوردەوە هەیە، یەکەمیان پەیمانی (سیڤەر)ە کە لە 20/ ئابی 1920 لەنێوان ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و ئینگلتەراو فەرەنسا مۆرکرا، ئەم پەیمانەش جۆرێک بوو لە سیاسەتی (پەرتکەو زاڵبە)، بە گوێرەی ئەم پەیمانە داگیرکاری کوردستان ئاوا کرا، سەرەڕای دیاری نەکردنی سنوورو ناوچەکانی بەشێوەیەکی باش. لەم نێوەدا مرۆڤ دەتوانێ تێبینی گەلێک پەیمانی هاوشێوەی (سیڤەر) بکات لە ناوچەکانی تری دنیادا، بۆ نموونە بەهەمان شێوە لەلایەن دەوڵەتە ئەورپییەکان لە ساڵی 1885 ئەفریقیا دابەش کرا، هەروەها لە ساڵی 1920 دەوڵەتە عەرەبییەکانیان پارچە کردو بەم چەشنەش دوای شەڕی یەکەمی جیهانی (هندستان)یان دابەش کرد. بەڵام نیشتمانی عەرەبیان لەژێر (ئینتداب) داو بەسەر چەند دەوڵەتێک دابەش و پارچە پارچە کرد، بەڵام کوردستانیان بەسەر ئەم دەوڵەتانە (عەرەبییەکان) و تورکیاو ئێران دابەش کرد.

دووەمینیان کە پەیوەندی بەچارەنووسی گەلی کوردەوە هەبوو پەیمانی (لۆزان) بوو، کە لە 24/ تەموزی 1923 مۆرکرا، لەم پەیمانەدا کوردستان پارچە کراو لێک هەڵوەشێنرایەوەو بەکردار پارچەکردن پیادەکرا، پەیمانێکی لەم شێوەیە لە کوردستاندا نەبێ لە هیچ دەوڵەتێکی دنیادا دروست نەبووە، پەیمانی (لۆزان) تەنها سیاسەتی (پەرتکەو زاڵبە)ی کلاسیکی نییە، بەڵکو پەیمانێکی تایبەت بە کوردە لە جۆری سیاسەتی (پەرتکەو زاڵبەو قڕکە). لەم پەیمانەداو بە مەبەستی سڕینەوەی ناوی کوردو نەخشەی کوردستان و دەرکردنی لە مێژوودا کوردستان و گەلی کوردیان پارچە پارچەو دابەش کرد، هەروەها هەموو مافێکی نەتەوایەتی گەلی کوردیان زەوت کرد. وە هەموو دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بەدژە چالاکی سیاسی و فیکری و بەهاوبەشی، توانیان سەرجەم ڕاپەڕین و سەرهەڵدانەکانی کورد بخنکێنن کە لە پێناوی گەڕانەوەی مافی نەتەوایەتی و دیموکراتی خۆیان کردیان. هەروەها

هەموو نەخشەو پیلانێکی سەرکوتکەریان بۆ نەهێشتن‌و سڕینەوەی ناسنامەی کوردو نەخشەی کوردستان پیادە دەکرد، هەر ڕێگاو شێوازێکیان بۆ سوکایەتی پێکردنی کوردو کۆیلەکردنی مرۆڤی کورد گرتەبەر، وە بۆ پیادەکردنی ئەم شتانەش بەرژەوەندی دەوڵەتی تورکیا لە سەروی هەر بەرژەوەندی‌و ئیعتبارێك دانرا، بۆ نمونە کەمالیستەکان ویلایەتی موصل‌و کەرکوك (باشوری کوردستان)یان بە بەرتیل دا بە ئینگلیزو لەبەرامبەر ئەمەش ئینگلیز ڕێگای لەبەردەمی هەر تواناکاری‌و ئامادەکاری‌یەکی دامەزراندنی گەل کورد گرت بۆ گەیشتن بە هەر جۆرە ئۆتۆنۆمی‌یەك یان شتێکی لەو بابەتەو هاوکاری‌یەکی چڕوپڕ لە نێوان کەمالیستەکان‌و ئینگلیزو فەرەنسی‌یەکاندا لەلایەك‌و لە نێوان کەمالیستەکان‌و داگیرکەرە عەرەب‌و فارسەکاندا لە ئارادابوو، ئەو هاریکاری‌و یەکگرتنەش لەسەر هەموو ئاستێکی سیاسی‌و فیکری‌و سەربازی دەکرا. تاکە سیاسەت کە دەوڵەتی تورکیا بەرامبەر گەل کورد بەڕێی دەکا سیاسەتی تیرۆری ڕەسمی‌یەو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد تیرۆرو زوڵم پیادە دەکات، دەیەوێ بەقڕکردنی گەل کوردو لەناوبردنی کۆتایی بەکێشەی گەل کورد بهێنێت! لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا لە تورکیا تەنانەت یەك گەرد مافی مرۆڤ نی‌یە، کوردستان بەبڕیاری تایبەتی (قەرارنامە) بەڕێوەدەبرێت ئایا داگیرکەران بەبڕیاری تایبەتی نابردرێن بەڕێوە؟ لە کوردستان لادێ‌و گوندەکان دەسوتێنرێن‌و کاول دەکرێن، ماڵ‌و خانووبەرە بەکەل‌و پەل ناوڕیشیانەوە لەگەڵ زەوی تەخت دەکرێت‌و دەکرێتە خۆڵەمێش، دارستان‌و کێڵگەو ڕەزوباخ دەسوتێنرێن‌و بگرە ئاژەڵیش لە کوردستان لە تیرۆری دەوڵەت ڕزگاری نابن، خەڵکی ناچار دەکرێن کە ماڵ‌و لادێکانیان جێ بهێڵن.

لە سەردەمی کۆماری تورکیادا لە کوردستان ئەشکەنجەو تیرۆرو زوڵم‌و زۆرداری بەڕێوە دەچێت‌و حوکم دەکرێت، ئەمڕۆ لە کوردستان کۆڵەکەی سیاسی دەوڵەت ئەشکەنجەو تیرۆرەو بەشێوەیەکی بەرفراوانیش ئەو سیاسەتەی پیادە دەکات، تەنها بۆ ئەوەی ڕێگا لە ڕۆڵەکانی گەل کورد بگرێت تا هاریکاری ڕاپەڕیوان نەکەن. باوك لەبەرچاوی خێزان‌و منداڵەکانی ئەشکەنجە دەدرێ لەپێش چاوی پیاوەکان ئافرەتەکان ئازارو ئەشکەنجە دەدرێن‌و منداڵ‌و شیرە خۆر بەسەرەنێزەی چەك دەتۆقێنرێن‌و کچان بەقژ پەلکێش دەکرێن، هەر شتێك دەکەن تەنها بۆ سەرشۆڕکردن‌و سوکایەتی پێکردنی مرۆڤی کوردو سڕینەوەی ناسنامەی نەتەوەیی کورد. بەبیانووی پشکنین، ماڵەکان تاڵان دەکەن، زوڵم‌و زۆر لە کورد دەکەن‌و خێزانەکان سەرگەردان دەکەن، لە کاتێکیشدا تورکیا بەشێوەیەکی چڕو پڕ لەسەر مافی تورکەکانی بولگاریاو (تورکیای ڕۆژئاوا) لە یۆناندا بەدەنگ دێ‌و دەیەوێ سەرکەوتن لەسەر ئاستی دەوڵەتی فیدراڵی تورکی لە (قبرس) بەدەست بهێنێ. هەر لەو کاتەدا بە هەموو هێزو توانای خۆیەوە دێتە مەیدان بۆ ئەوەی نەهێڵێ 30 ملیۆن کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کوردستانێکی یەکگرتوو سەربەخۆو دیموکراتی ئاوا بکەن!!

بەڕێز: گارا لامارش

سیاسەتی تورکیا سیاسەتێکی ڕەگەزپەرستی داگیرکەری‌و ئیمپریالیزمی‌یە. حکومەتی ئێوەش (USA) گەورەترین پشتگیرو لایەنگری ئەم سیاسەتە ناهاوچەرخی‌و نامرۆڤایەتی‌یەیە، ئەمەریکا تا دوایی هانی تورکیا دەدات بۆ پیادەکردنی ڕەگەزپستی‌و سیاسەتی ئیمپریالیزمی، بۆ ئەوەی (واقیع)ی ئێستای کوردستان بپارێزێت واتە ڕژێمی کۆلۆنیاڵ ئێودەوڵەتی.

USA هەر شتێك دەکات بۆ جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە، ئەمەش واتە پاراستنی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی‌و چاوچنۆکی پیسی تورکیایە.

دوای ئەوەی بە زەبری هێز دەوڵەتی عێراق شکستی پێهێنراکە لە 20/ ئابی 1990 (کوێت)ی داگیرکرد، وشەی کوردو کوردستان لەو وشانە بوون کە زۆر بەبەردەوامی بەرگوێ دەکەوتن، هەروەها گوێمان کاس بوو بە بەیاننامەی ئەمەریکا کە ڕایدەگەیاند ڕێگانادات دەوڵەتێکی کوردی دابمەزرێ‌و ئۆزال‌و ڕەفسنجانی ڕێککەوتنیان کردوە کە ڕێگانادەن دەوڵەتێکی کوردی ئاوابێ‌و عێراق‌و تورکیاو ئێران حەزناکەن‌و نایانەوێت دەوڵەتی سەربەخۆی‌کورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا هەبێت‌و ئەمەریکاو یەکێتی سۆڤیەت ڕێگانادەن دەوڵەتی کوردی دروست ببێ‌و ئۆزال دەڵێت دروست کردنی دەوڵەتی کوردی شتێکی خەیاڵی‌یە.

هەموو ئەو دەنگ‌و باسانەش تەنیا بۆ ئەوەن کە بویەری کوردستان هەروەکو خۆی بەژێردەستەیی بمێنێتەوە، لە کاتێکدا (تورك‌و عەرەب‌و فارس) لە ڕێگای زوڵم‌و زۆرو ئەشکەنجەوە حوکمی کورد دەکەن‌و کورد ناچار دەکەن کەوا پیسایی مرۆڤ بخوات، بۆچی دەبێ لەڕێگای (تورك‌و عەرەب‌و فارس)ەوە گەل کورد حوکم بکرێ؟ بۆچی دەبێ کورد خۆیان بەڕێوەنەبەن؟

بە بۆچوونی من خراپترین بەڕێوەبەرایەتی کورد بۆ خۆیان لە باشترین بەڕێوە بردنی ئەو ڕژێمە دڕندانە باشترە. حکومەتی ئێوە (USA) پشتگیری سیاسەتی ڕەگەزپەرستی‌و داگیرکەری تورکیا دەکات لە کوردستان داو یارمەتی بێ‌پایان و بەردەوامی لەهەر حکومەتێك زیاتر دەداتە چاوچنۆکی کۆلۆنیالیزمی تورکیا، ئەمە لە کاتێکدا کە گرنگترین ئەرکی نوسەرو ڕۆشنبیرانی ئەمەیکا لە ڕۆژی ئەمڕۆدا ڕەخنە گرتنە لەم سیاسەتە گەندەڵەی حکومەتەکەیان.

بەڕێز: گارا لامارش

لە سەرەوە سیاسەتی گەندەڵ‌و دژ بە مرۆڤایەتی‌یەکەی حکومەتی‌ئێوەمان دەستنیشان کردو لەسالانی هەشتاکاندا حکومەتەکەتان ڕاپۆرتی دەنووسی‌و دەیگوت: پێشکەوتنی بەرچاو لەباری مافی مرۆڤ لە تورکیادا هەیە، لە کاتێکیشدا لە هەموناوچەکانی تورکیادا سیاسەتی ئەشکەنجە بەشێوەیەکی فراوان لە لایەن پۆلیس‌و جەندرمە لەزیندانەکاندا پەیڕەو دەکرا، بۆ نموونە لەزیندانی سەربازی (دیاربەکر) دا هەموو ئەو کوردانەی کە ڕازی نەبوون بڵێن (من تورکم- من بەختەوەرم)، هەموو ئەوانەی ویستیان ناسنامەی نەتەوەیی خۆیان بپارێزن لەژێر ئەشکەنجەدا کوژران.

بەڵێ! (40) وڵاتپارێزی کورد بەم شێوەیەو لەڕێگای ئەشکەنجە کوژران، سەرەڕای ئەوەش حکومەتی ئێوە ڕاپۆرتێکی لەسەر مافی مرۆڤ لە کوردستاندا نوسیوەو لەو سەردەمەداو دەڵێت: (پەرەسەندن‌و پێشکەوتی ئیجابی‌و گرنگ لە پرسی مافی مرۆڤ لەتورکیادا بەدی دەکرێ، ئێمە لەبەر ئەم شتەو کارەی حکومەتەکەتان هەست بە شەرمەزاری دەکەین!).

لە ساڵی 1989 (نەقابەی پارێزەران) لە نیویۆرك دەربارەی ئەشکەنجە لە تورکیا ڕاپۆرتێکیان نوسیوەو دەڵێت: ((هەندێك لەو کەسانەی کە لە کوردستاندا شەڕی تایبەتی ئەوان لەسەر شێوازی ئەشکەنجەکردن پەروەردەیان بینیوە، هەڵسانی حکومەتەکەتان بە پەروەردەکردنی لەسەر ئەم شتە پیسانەو خەرج کردنی توانایەکی زۆر لە پێناوی پاراستنی چاوچنۆکی ئیمپریالیەت‌و ڕەگەزپەرستی تورکیا پڕ لە شەرمەزاری‌یە، کە بەناوی مرۆڤایەتی‌و دیموکراتی‌و مافی مرۆڤ پیادە دەکرێت.

# بەشێك لە چاوپێكەوتنێكی ڕۆژنامەنووسی گۆڤاری 'سەربەخۆیی بوون' لەگەڵ دكتۆر ئیسماعیل بێشكچیدا

- **پەیامی ئێوە چییە بۆ گەلی كوردستان؟**

– ا/لەم خاڵەدا دەمەوێت دەستنیشانی فرمانێكی بناغەیی تر بكەم. ئەویش پێویستیەكی شیكردنەوەو توێژینەوە زانستییەكانە لەسەر كوردستان ئەو كەسانە یا دەزگایانەی لێكۆڵینەوە لەسەر كوردستان ئەنجام دەدەن پێویستە خاوەن ئەقڵێكی سەربەخۆ بن. پێویستە لێكۆڵینەوەو توێژینەوەی مەسەلەی كوردو مێژووی كوردو بنەمای كۆمەڵگای كوردەواری و زمان و فەرهەنگی كوردی و چەندەهای تر ئەنجام بدرێن، سەرەڕای ئەو مەترسیانەی كە لە ئەنجامی ئەو كارەوە دروستدەبن. چونكە زانیاری ئێمە دەربارەی كوردستان كەمە ئەو زانیاریانەی كە هەمانە پڕە لە هەڵە. چونكە دەوڵەتە داگیركەرەكانی كوردستان ئەوەی لە دەستیان بێ كردوویانە لە پێناوی سەلماندنی نەبوونی كوردەكان و بزركردنی هەموو شوێنەوارێكی مێژوویی و فەرهەنگییان. ئەو بەڵگەنامانەی كە لەسەر كورد هەبوون هەموویان سەرنگوم كرد. لە لایەكەوە نكۆڵی لە بوونی كورد دەكەن و لە لایەكی تریشەوە ئەو بەڵگەنامانەی كە تایبەت بوون بە كوردەكان هەموویان سووتاند یا فەرامۆشیان كردووە. پاشماوە كۆنەكانیان دزی و لە ناو برد. هەموو هۆیەكیان بەكارهێنا بۆ سڕینەوەی مێژووی كوردو كوردستان و هێشتنەوەیان لە تاریكی. بۆ ئەم كارەش یەكتریان بێ یارمەتی نەكرد. ئەركی كوردەكان لەم كاتەدا بێگومان هەستانە بە شیكردنەوەو لێكۆڵینەوەی زانستی لە هەموو بوارێكداو بە هەموو تواناییانەوە ئەو كەسەی پێویستی بە زانیاری دەبێت، هەر ئەوە كە زانیاری دروستدەكات و پێویستی كوردەكان بۆ زانیاری گەلێ زۆرە. لەبەرئەوە كوردەكان دەبێ خۆیان زانیاری تایبەت بە كوردستان بهێننە ئاراوەو پێویستە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەرلەنوێ بنووسرێتەوە. پێویستە مێژووی توركیاو ئێران و عێراق و سوریاو لوبنان و فەلەستین سەرلەنوێ بنووسرێنەوە. هەر كوردەكانن توانای ئەم كارەیان هەیە چونكە كوردەكان بە پێی ئەو سەرچاوانەی كە لەبەردەستدایە لە هەمووان زیاتر زەرەریان لێكەوتووە. نووسینەوەی سەرلەنوێ كێشی ڕامیاری و كۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی كوردەكانیش دەگرێتەخۆ. پێویستە لەسەر كوردەكان هەر لە ئێستاوە دامودەزگای خۆیان دابمەزرێنن. پێویستە پشتگیریان بكرێت تاكو بتوانن لێكۆڵینەوەو توێژینەوە بە ئەقڵیەتێكی سەربەخۆ ئەنجامبدەن. سوور بوون لەسەر ئەقڵیەتی سەربەخۆ كارێكی زۆر گرنگە بۆ كوردەكان. لە دوایی‌دا لە تواناد‌ا نابێ كە نەبوونی هێزی سیاسی و سەربازی مەزنی كوردەكان پشتگوێ بخرێت. ئەو هێزەی كە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێت. لە كاتی ئێستادا هەندێك دەوڵەت هەن كە یارمەتی هەندێ لە بزووتنەوە كوردییەكان دەدەن، پێویستە بە ئەقڵیەتێكی سەربەخۆ ڕەخنە لەم پەیوەندییانە بگرین. چونكە یارمەتیدانی دەوڵەتێك مانای ئەوە ناگەیەنێ كە نابێ ڕەخنەبگرین. پێویستی بۆ خەباتە زانستییەكان بە شێوەیەكی گشتی دێتە ئاراوەو بە تایبەتی كاتێ كە پێشكەوتن و دەرك كردنی مەسەلە كۆمەڵایەتی و ڕامیارییەكان دێنە مەیدانەوە هەڵبەتە لێكۆڵینەوە ئەم دەرك كردنە دەوڵەمەند دەكات. پێویستە لەسەر بنكە سیاسییەكان لە كوردستان یارمەتی دەزگا هاوكارەكان بدەن تاكو بتوانن بە ئازادی لێكۆڵینەوەو وردبوونەوە ئەنجامبدەم.

ب/پێویستە كوردەكان خاوەن ڕای تایبەتی خۆیان بن دەربارەی مێژوو و كۆمەڵ و جیهان. پێویستە لەسەر كوردەكان بە تێڕوانینی تایبەتی خۆیان لە مێژوو و كۆمەڵ و جیهان بنۆڕن. تێگەیشتنی كوردەكان بۆ مێژوو و كۆمەڵ جیاوازی هەیە لەگەڵ تێگەیشتنی تورك و عەرەب و فارس. هەروەها تێڕوانینی كوردەكان جیاوازە لەگەڵ ئەوان بۆ مەسەلە ڕامیاری و كۆمەڵایەتییەكان بۆ نموونە پەیماننامەی لۆزان كۆیلەتیەكی تەواوە بۆ كوردەكان. بە پێی پەیماننامەی لۆزان كوردستان دابەش و پارچە پارچە كرا لە نێوان چەند وڵاتێكدا. هەر بە پێی ئەو ڕێكەوتننامەیە كوردەكان بوونە كۆیلەو نموونەی ئەمەش لە هیچ شوێنێكی تری جیهاندا نابینرێت. بەڵام پەیماننامەی لۆزان بۆ توركەكان مانایەكی تر دەبەخشێت. لۆزان بۆ ئەوان مانای سەربەخۆبوون و بنیاتنانەوەیە واتا دروستكردنی دەوڵەتێكی بەهێز لەسەر پاشماوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی. واتا دەركردنی دەستدرێژكەران لە ئەنادۆڵ و گەڕانەوەی ئازادی و سەربەخۆیی بۆ توركەكان. هەتا توركە شۆڕشگێڕو ماركسییەكانیش هەر بەو مانایە لە لۆزان دەگەن. لێرەدا بایەخی ئەوەمان بۆ بەدیار دەكەوێت كە دەبێ كوردەكان خاوەن ڕای تایبەتی خۆیان بن. هەر بە هەمان پێوەر دەتوانین مەسەلەی قەسابخانەی ئەرمەنەكان بهێنینە گۆڕێ. توركەكان و ئەرمەنەكان بە شێوەیەكی جیا لە یەكتر بیردەكەنەوە. هەروەها عەرەب و فارسەكان بە ڕێگای جیاواز دەربارەی جەنگی عێراق-ئێران بیردەكەنەوە.

هەندێ كات ڕەخنە لە بیرۆكەی ناوبراو دەگرن و دەڵێن: (لەوكاتەی مێژوو نووسراوە كورد هیچ بوونێكی نەبووە. نكۆڵی لە بوونی كورد كراوە تا ئیمڕۆش. بەڵام ئێستا هەوڵدانێكی بە پێچەوانە لە گۆڕێدایە..) بێ شك ئەمە هەڵەیە. چونكە كوردەكان نكۆڵی لە بوونی كەسێك ناكەن. بوونی توركەكان و عەرەبەكان و فارسەكان دەسەلمێنن و هەتا هەوڵی ئەوە دەدەن جێگای مێژوویی ئەوان بگرنەوە. دەیانەوێ ئەوە بڵێن كە ئە سەلماندنی 30 ملیۆن كورد لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە كارێكی زانستی ئاژمێردرێت لەبەرئەوە تێڕوانینی كوردەكان بۆ خۆیان و مێژوویان كۆمەڵگایان جیاوازی دەبێت لەگەڵ تێڕوانینی توركەكان و عەرەبەكان و فارسەكان. خۆ چەكداركردن بەم جۆرە تێڕوانینەو تێگەیشتنە هیچ مەترسیەكی نابێ بۆ سەر كەسێك. كاتێ مرۆڤ لە مێژووی كوردەكان ورد دەبێتەوە دەبینێ چۆن ئادەمیزادی كورد، گەلی كورد. بە درێژایی مێژوو بوونەتە كۆیلەو ئەم كۆیلەتیەش تا ڕۆژی ئەمڕۆ بەردەوامە. ئەم مێژووە مێژووی كۆیلایەتییە بەڵام ئیمڕۆ كوردەكان ئەم كۆیلایەتییە قاودەدەن و پێویستیەتی ئەمێشتنی ئەم ئەنگییە دەرك پێدەكەن و بەو هەست كردنە هەنگاو دەنێن بەرەو مێژوو و كۆمەڵگا. لێرەدا بە پلەی یەكەم ئازادی بیر دێت. پێویستە هەر مرۆڤێك ئازاد بێت لە دەربڕینی بیروڕای خۆی و ڕەخنەگرتن. بیركردنەوە لەم بابەتە بەو جۆرە هیچ زیانێكی نابێت بۆ مەسەلەی كوردی. بوونی مەترسی ئازادی بیر لە مەیدان ڕادەكات. زانكۆكانی توركیاو مامۆستا توركەكان و ڕاگەیاندنی توركی و لێكۆڵەرەوە توركەكان لایەنگری توركەكان دەگرن. كاتێ دەڵێن: چەند شادە ئەو كەسەی كە توركە. نا بەم وتەیان بوونی كوردەكان ناسەلمێنن، ئەوان ئازادی بیریش ناپارێزن. بیری بەرهەڵست تووشی لێپرسینەوە دەبێت. هەتا بەرهەڵستی سزادانی بیریش ناكەن و مەترسیش لەم خاڵەدایە.

پێویستە كە شۆڕشگێڕە توركەكان مێژووی كوردو كۆمەڵگای كوردەواری وەك كوردەكان سەیر بكەن. ئەم پێویستیەش ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندایە.

کاتێ کە کۆمۆنیستی تورکی (ئیبراهیم کایپاککیا) لە دابەشکردنی کوردستان بە پێی ڕێکەوتننامەی لۆزان دەکۆڵێتەوەو ئەم دابەشکردنە بە زوڵم دەزانێت و دەبێژێت: ئەم زۆرلێکردنە کۆن بووە ناتوانین ئەمڕۆ لێی بکۆڵینەوە). بەمە ڕێ لە بەردەم پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و کێشەی چینایەتی دەگرێت.

لەبەرئەوە کۆمۆنیستەکان نابێ لە بەرامبەر ئەم مەسەلەیەو ئەهێشتنی ئەم دەستدرێژکارییە بوەستن. ئەمەش کارێکی ئاقڵانە نییە. بزووتنەوەی کۆمۆنیستی تورکی لێپرسراویەتی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی تەنیا لە چوارچێوەی سنووری تورکیا دەگرێتە ئەستۆ. پارتە کۆمۆنیستییەکان لە عێراق و ئێران پێویستە بە پێی باری خۆیان چارەسەر بۆ ئەم مەسەلەیە بدۆزنەوە تا لەم کاتەدا زوڵم نامێنێت). مختارات- هەڵبژاردەکان ل: 215-217.

هەڵبەتە کوردەکان بەم شێوەیە بیرناکەنەوە. (باشترین چارەسەر بەپێی تێڕوانینی کوردی چارەسەر نییە. کوردەکان ئەوە دەزانن نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت کە ئیمپریالیزم کوردستانی دابەش و لەت لەت کردووە. بەرژەوەندیو داوای کوردەکان دەبێ لەبەرچاوبگیرێ. کوردستان لەسەر دەستی ئیمپریالیزمی فەڕەنسی و ئینگلیزی و کەمالیستەکان و میرنشینە عەرەبەکان و فارسەکان پارچە پارچە کراوە. کوردەکان بەم دابەشکردنە دەزانن و ڕەتی دەکەنەوە. شۆڕشگێڕە تورکەکان بەم کارە نازانن و تێی ناگەن لەبەرئەوە کارەکە پەسەند دەکەن. ئیبراهیم کایپاککیا بە تەنێ بەم جۆرە بیرناکاتەوە بەڵکو زۆری تر هەن کە بە هەمان شێوە یا زیاد یا کەمتر بیردەکەنەوە بۆ نموونە: مەهری بللی، ماهر حایان، محمد علی ئەیبار، دنیز گزمیش، حیکمەت میفلجملی، دوغان الجی اوغلو بهیج بوارێ. کارلێکردنی کەمالیەت لەسەر چەپی تورکی زۆر ڕوون و ئاشکرایەو پێویست بە گفتوگۆ کردن ناکات. ڕزگاربوون لەم کارلێکردنەش ئاسان نییە. بۆ نموونە کاتێ ئیبراهیم کایپاککیا ڕەخنە لە مهری بللی دەگرێ دەربارەی مەسەلەی نەتەوەیی و بە کەمالیستی ناودەبات، بۆ خۆشی لەم کارلێکردنە بەدەر نییەو سەربەخۆ بیر ناکاتەوە. کەواتە پێویستە شۆڕشگێڕە کوردەکان بۆ هەر مەسەلەیەك کوردانە بیر بکەنەوەو ڕێگاو شێوازی خۆیان بە خۆیان هەڵبژێرن و توانای خۆیان بەرەو پێشەوە ببەن. دەتوانین ئەوەش بڵێین کە بیروڕای شۆڕشگەڕە تورکەکان بۆ مەسەلەکان نازانستانەیە. لە هەمان کاتدا بیروڕای شۆڕشگێڕە کوردەکان زۆر زانستیانەیە چونکە هەروەك وتمان ئەو کەسەی کە پێویستی بە زانست هەیە هەر خۆیەتی کەدروستی ئەکات و دەیهێنێتە مەیدانەوەو پێویستی کوردەکان بۆ زانین گەلێکە. کوردەکان زۆرتر زەرەرمەندن لەوەی کە نووسراوەو ڕوویداوە. شۆڕشگێڕە تورکەکان بە ئاسانی لە کەمالیەت ڕزگاریان نابێت. ئەو نوسراوانەی کە دەربارەی مێژوو و باری ئێستا دەردەچن ناڕەحەتی شۆڕشگێڕە تورکەکان ڕادەگەیەنن. لەبەرئەوە ساویلکەییە کە چاوەڕوانی تورکەکان بکرێت تا سەرلەنوێ مێژوو بنووسنەوە. ڕەخنەگرتنی سەرانی شۆڕشگێڕانی تورکیا لە کەمالیزم و قەبوڵکردنی چوارچێوەی گشتی کەمالیزم ئەم شتەی سەرەوە بەدیاردەخات، نەبوونی توانای چاوەڕوانی.

پێویستە کوردەکان لە هەندێ مەسەلە بنۆڕن و ڕیسوای بکەن. بۆ نموونە بۆنەی 23ی نیسانی میهرەجانی منالان و 29ی تشرینی یەکەمی دامەزراندنی کۆمارو 30ی ئەیلول ڕۆژی سەرکەوتن بەسەر یۆنان و 19ای ئایاری جەژنی وەرزش و لاوان و بۆنەی تر کە بە بۆنە کوردییەکان ئاژمێردرێن. بەهۆی یاساو فرمانەکان کوردەکان ناچاردەکەن کە ئاهەنگ بەم بۆنانەوە بگێڕن. کوردەکان ئەم ساڵ هەستیان بەم کارە کردووە هەوڵ دەدەن بەشداری بۆنە نەتەوەییەکانی ڕەسمی دەوڵەت نەبن. ئەمانە بۆ کوردەکان بۆنە نین ئەوانە بۆنەی مێژوویین کە کوردەکانیان کردە کۆیلە. هەر بە هۆی ئەمانەوە کوردستان کرا بە موستەعمەرەی نێودەوڵەتان. جەژنی نەتەوەیی کوردی دەکەوێتە 21ی ئازار. کوردەکان سەرەڕای هەموو شێوەیەکی زۆرلێکردن و سەرکوتکردن و دامرکاندنەوە ئاهەنگ بەم بۆنەیەوە دەگێڕن.



لێرەدا خاسیەتێکی تریش لە کوردستان دەبینرێ. وەك ڕزگارکردنی ماردین، ڕزگارکردنی هەکاری لەژێر دەستی داگیرکەران، ڕزگارکردنی بەدلیس و وان لە دەست درێژکەران. ئەمە گەمە پەخۆ کردنە. گەمە بە خۆکردنی مێژووە. لەم ڕۆژانەی ئێستادا کوردستان لە بن دەستی دوژمنان رزگار نەکراوە. بە پێچەوانەوە کوردستان کەوتە ژێر دەستی دوژمنێکی نوێ و ئەویش دوژمنی تورکییە. بێجگە لەمانە دوژمنایەتی و داگیرکردنی نوێ زۆر لە جاران دڕندانەترو خوێناوی ترە. مرۆڤ لە هیچ شوێنێك ئەم دڕندانەیەتی و کۆنەپەرستییەی بەرچاو ناکەوێت. چونکە کوردستان و گەلی کوردیان داگیرکردو شوێنەواری ماددی و مەعنەوییان

نەهێشت. داگیرکردنێك كە ناویشیان لەسەر ڕووی جیهان سڕییەوە. داگیرکردن و دەستبەسەراگرتن و ئیمپریالیزم شان لە شانی یەکدان لە کوردستان. کوردستان لە ڕووی سەربازیو ڕامیارییەوە زەوت کراو ئێستاش نۆرەی ئیمپرالیزمی ئابوورییە، دەشڵێن: (لەژێر دەستی دوژمنان ڕزگارمان کرد).

لە ڕاستیدا ئەگەر کوردستان لەژێر دەستی داگیرکەرێکی تردا بایە بۆ نموونە وەك ئیمپریالیزمی ئینگلیزی ئەوا لە مێژەوە ڕزگاری بوو بوو. هیچ هێزێکی ئیمپریالیزمی تر بەو تێکدانە هەڵنەدەستا کە دامودەزگای تورکی ئەنجامی داوە. چونکە ئیمپریالیزمی تورکی هێرشی کردۆتە سەر هەموو نرخ و بنەمایەکی مرۆڤی کورد. کەرامەت و ئابڕۆی کوردیان خستە ژێر پێی خۆیان. مرۆڤی کوردیان ڕووخاند. هیچ هێزێکی ئیمپریالیزمی لە چ شوێنێکی تری جیهان وەکوئەوانیان نەکردووە. لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەت سیاسەتی ئیمپرالیزمیانەی خۆی دەشارێتەوە لەژێر پەردەی ئاهەنگ گێران بە بۆنەو جەژنەکانی بەناو (سەربەخۆ بوون). هەرچەند زیاتر مێشکی کوردان بکرێتەوەو بنج و بناوانی ئەو مەسەلانە بزانن ئەوا پیسێتی ئیمپریالیزمی تورکی لە هەموو ڕوویەکەوە دەردەکەوێت.

داگیرکەران دەڵێن (جوداخوازەکان)، (ناپاکانی نیشتمان) ئەی چەند تێگەیشتنێکی هەڵەیە. سەپاندنی وشە یا وەسفی جوداخوازی بەسەر کوردەکان هەڵەیەکی گەورەیە. چونکە کوردەکان نیشتمانی تورکەکان (تورکیا) پارچە پارچە ناکەن، بەڵکو بەرگری و پارێزگاری لە نیشتمانی خۆیان کوردستان دەکەن. ئەوان داوای ڕزگارکردنی خاکەکەیان دەکەن کە لەت لەت کراوەو بۆتە کۆلۆنی نێودەوڵەتان. لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە داگیرکەران جوداخوازی ڕاستەقینەن. یارمەتی یەکتریان داو کوردستانیان دابەشکرد. ئیمپریالیزمی تورکی کوردەکان بە جوداخوازی تاوانبار دەکات و بە خۆشی بە نهێنی هاوکاری لەگەڵ ئیمپریالیزم دەکات و دەیەوێت ڕاستی مێژوویی بشارێتەوە لەبەرچاوان. ئیتر دەوڵەت ناتوانێت سیاسەتی دوو ڕووانەی خۆ لە مەولا بەردەوام بکات.

پێویستە هەر لەم گۆشەنیگایەوە مەسەلەی (ناپاکی نیشتمان) هەڵسەنگێنین. کوردەکان بەرگری لە نیشتمانی خۆیان دەکەن و هەوڵی ڕزگارکردنیشی دەدەن لە بن دەستی ئیمپریالیزم، لەبەرئەوە ئەوان نیشتمانپەروەرن. هەڵبەتە لە کوردستان خۆفرۆشان و ناپاکان هەن و ئەوانیش ئەوانەن کە هاوکاری لەگەڵ ئیمپریالیزمی تورکی دەکەن لە دژی وڵات و گەل خۆیان. دەزگای ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەو زانکۆکان و پارتە سیاسییەکان و ئیمپریالیزمی تورکی هەموو کارو کردەوەیەك ئەنجام دەدەن لە پێناوی شێواندنی ناوەڕۆکی ئەم چەمکانە، بەڵام سپی لە ڕەش جیادەبێتەوەو کێشەکەش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر ڕوون دەبێتەوە. هێزە دەستدرێژکەرەکان، وە پاشان هێزە نیشتمانییەکان کە بەرەنگاری دوژمن دەبنەوە خاوەن تێڕوانینی تایبەتی و جیاوازن دەربارەی ناپاکی و فرۆشتنی نیشتمان.

ج-لێرەدا مەسەلەیەکی تر لە گۆڕێدایە کە پەیوەندیدارە بە جەوهەری کێشەی کوردی و پێویستە هەڵوەستەیەکی بۆ بکەین. کێشەی کوردی کێشەیەکی نێودەوڵەتانە. ئەمەش بەری ئەو بارەی ئێستای کوردستانە بەهۆی دابەشکردن و پارچە پارچە کردن. لە لایەکی تریشەوە چونکە وڵاتانی وەکو وڵاتە یەککگرتووەکان و یەکێتی سۆڤیەت و بەریتانیاو فەرەنساو ئەڵمانیا گفتوگۆو لێکۆڵینەوە لەسەر کێشەی کوردی دەکەن. ئەو کۆبوونەوانەو پێککەیشتنانەی کە تا ئێستا ئەنجام دراون دوو قۆڵی و نهێنی بوونە: لە نێوان تورکیاو عێراق- تورکیاو ئێران- تورکیاو سوریا. لە نێوان ئێران و عێراقیشدا پێککەیشتنی دوو قۆڵی و نهێنی ئەنجامدراوە. زۆر ڕوونە کە نوێنەرایەتی کوردەکان لەو بە یەککەیشتنە دووقۆڵی و نهێنییانەدا نەبووە. بێجگە لە نەبوونی نوێنەری کوردەکان، لەم چاوپێکەوتنە دووقۆڵییانەدا نەخشەی زۆر پیلان و یاری تازە دژی کوردەکان ئەنجام ئەدرێت. لەبەرئەوە نێونەتەوەیی کردنی کێشەی کوردی و باسکردنی لە دامودەزگا دەوڵەتییەکان کارێکی بایەخدارە. ئەمە مەسەلەی کوردی لە ڕووی ئایدۆلۆژی و ڕامیاری پێشدەخات و پەرەی پێدەدات. پێویستە کوردەکان نوێنەریان هەبێت لەم دەزگایانەو ڕای خۆیان لەوێ دەربڕن. بێگومان ئەم دەزگایانەش دۆستی کوردەکانی هەر تێدا دەبێت.

دەمەوێ جەخت بکەمەوە سەر قسەکەم: کێشەکە لە پەرلەمانی ئەورووپی، ئەنجومەنی ئاسایشی ئەورووپی، ڕێکەوتننامەی هێلسنکی ئەم دواییە، ڕێکخراوی لێبووردنی جیهانی و زۆر دامەزراوی تری نێودەوڵەتان باسدەکرێت. هەندێك کات ئەم کێشەیە لە هەندێ پارلەمانی وڵاتاندا گفتوگۆی لەسەر دەکرێت، کاتێ لێدوان و لێکۆڵینەوەی مەسەلەی کوردی لە کۆنگرێسی ئەمریکی، پەرلەمانی فەرەنسی و پەرلەمانی ئینگلیزی ئەنجام بدرێت، پێشنیار دەربارەی ئەم مەسەلەیە بێتە ئاراوە، ئەم شتە دەبێتە هۆی پرسیارکردنی خەڵك: دەوڵەتان دووبارە پیلان دژی کوردستان ئامادە دەکەن؟ ئایا بۆ توێژینەوە لەسەر کێشەی کوردی دەکەن و چ گەمەیەکی نوێیان بەدەستەوەیە؟ بە بڕوای من پێویستە پیاو زۆر بە وردبینی لەم کارانە بڕوانێت.

بێگومان ئیمپریالیزم ڕۆڵی خۆی هەیە لەمەڕ کێشەی کوردی. ئەم ڕۆڵە لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەم. نێوان ساڵانی 1915–1925 زۆر بە گورجی هاتە مەیدانەوە. دابەشکردن و پارچە پارچە کردنی کوردستان هەر لەم ساڵانەدا ڕوویداو بە یارمەتی و نەخشەکانی ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسی و کەمالیستەکان و میرنشین و شێخ نشینە عەرەب و فارسەکان. ئەمەش گەورەترین نموونەیە لە مێژوو لە سیاسەتی ناکۆکی خستنەوەی ئیمپریالیزمی تیادا ئەنجام درابێت. بەرهەمی ئەم سیاسەتەش زۆر گران کەوت. ئەم سیاسەتی ناکۆکی نانەوە زۆر زۆر بوون. ئەو سیاستەی کە دوژمنانەکانی دڕندەترو دۆستەکانی گەل کوردی بەرەو خراپی برد. کاریگەری ئیمپریالیزم لەسەر مەسەلەی کوردستان لەو ماوەیەدا ڕۆڵی خۆی گێڕا. پێویستە توێژینەوەی مەسەلەی دابەشکردن و پارچە پارچە کردنی کوردستان و بارودۆخی کوردستانی ئەمڕۆ لەسەر بناغەی ڕاستییەکان بە درێژی ئەنجام بدەین. مەسەلەی گفتوگۆکردن لەسەر کێشەی کوردی و پێشنیاری پەرلەمانە دەوڵەتییەکان دژ بە بەرژەوەندی کوردەکان ناوەستێت. ئەم کردارە ئەو دەوڵەتانە بێزار دەکات کە کوردستانیان کردۆتە کۆلۆنی نێو وڵاتان و بە شێوەیەکی هاوبەش تێدەکۆشن تاکو کوردستان لەژێر دەسەڵاتیان بهێڵنەوە. بۆ نموونە دەگوترێ (وڵاتە یەککگرتووەکان، فەرەنساو بەرتیانیاو ئەڵمانیا باسی کێشەی کوردی دەکەن و هەوڵی خۆپاراستن و بەدەستهێنانی مەزنترین بەشی کێکی کوردی ئەدەن). ئەو وتانە دەبێتە هۆی بیرکردنەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

کوردەکان لە کێکی خۆیان بێبەش دەکەن و لە نێوان خۆیان دەیبەخشنەوە. بەڵام هەلوومەرج بە تەواوی جیاوازە. چونکە یەکێکە کە ئێستا لەژێر ڕەحمەتی ئیمپریالیزمی تورکی و عێراقی و ئێرانیدا دەپلیشێتەوە. بۆ نموونە سەددام حسێن لە پارچەیەکی ئەم کێکە چەکی کیمیاوی دروست کردو فڕۆکەو مێك و سۆسلۆڤی کڕی و بەم چەکانە هێرشی بردە سەر کوردەکان. تورکیاش پێویستی بەوە نییە کە ڕای کوردەکان بزانێت دەربارەی چۆنیەتی بەکارهێنانی ئاوی دیجلەو فورات. بە کورتی کوردەکان کێکێکی کوردی شك نابەن. بەڵام گەیشتنی مەسەلەی کوردی بۆ دامودەزگا جیهانییەکان و گفتوگۆ کردن و لێکۆڵینەوەی لەوێدا بە قازانجی کوردەکانە. لێرەدا جۆرە نارەحەتییەك بەدی دەکرێ دەربارەی گۆڕینی مەسەلەکە بۆ

مەسەلەیەکی کولتوری و گەیاندنی زیان بە خەبات لە پێناوی سەربەخۆیی یا دواخستنی. هەڵبەتەو پێویستیشە کە ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەك گفتوگۆی لەسەر بکرێ لە بەردەم دامەزراوە دەوڵەتییەکان کە یەکبگرێتەوە لەگەڵ خەباتی چەکداری لە کوردستان و تێکۆشین لە پێناوی ئازادی و سەربەخۆیی.

دابەشکردن و پارچە پارچە کردنی کوردستان بارودۆخێکی تایبەتی دروستکردووە هەر لەبەر ئەم بارە تایبەتیەشە کە سەربەخۆیی تەواوی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان و خەتی شۆڕشگێڕی بە زەحمەت ئەنجام ئەدرێت. چونکە سەرانسەری کوردستان لەژێر داری زۆردارو وابەستبووندا دەناڵێنێت. کوردستان بە دوژمن و هێزەکانییەوە چواردەورە دراوە. هەرچ کاتێك ئەو ڕێکخراوانەی، کە شەڕی ڕزگاری کوردستان دەکەن، میکانیزمی دابەشکردن و لەت لەتکردنیان دەرك پێکردو هەرچ کاتێك هەست و ئەستی کۆمەڵایەتی و مێژووییان گەشەی کرد، ئەوکاتە زۆرتر توانایان دەبێت بۆ دروستکردنی خەت و ڕێبازێکی سەربەخۆ. بەرژەوەندی بناغەی هەر شتێکە لە پەیوەندی نێو دەوڵەتاندا. بەرژەوەندی فرمانێکی ناوەندییە لە پەیوەندییەکاندا. هیچ ڕێکخراوێك یا دەوڵەتێك نییە کە یارمەتی پێشکەش بەهێزەکانی بزووتنەوە ئازادیخوازانەکان بکات لە پێناوی دادپەروەری و بیروباوەڕدا، بەڵکو بە دڵنیاییەوە بیر لە بەرژەوەندی خۆشی دەکاتەوە. بێگومان ئەوان چاوەڕوانی کاردانەوەیەکن کاتێ کە هاریکاری و پشتگیری بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی دەکەن. پێویستە لەسەر بزووتنەوە ئازادیخوازەکان خەبات بکەن لە پێناوی دادپەروەری و بیروباوەڕدا، بەڵکو بە دڵنیاییەوە بیر لە بەرژەوەندی خۆشی دەکاتەوە بێگومان ئەوان چاوەڕوانی کاردانەوەیەکن کاتێ کە هاریکاری و پشتگیری بزووتنەوەیەکی ڕزگاریخوازی دەکەن. پێویستە لەسەر بزووتنەوە ئازادیخوازی و شۆڕشگێڕییەکان کە بە وردی حیسابی ئەم پەیوەندییانە بکەن. پەیوەندییەکان بە حیساب کردنە. دەتوانرێت پەیوەندی سازبکرێت و ببەسترێت ئەگەر جۆرە هاوکێشییەك لە ئارادا بێت. لە توانادا نییە کە بەڕێوەبەرایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوایەتی کوردستان لە ناوەندە ئەورووپییەکانەوە بەڕێوە بردرێت. هەڵبەتە مانەوە لە ناوەندە ئەورووپییەکان و کردنەوەی نووسینگە لەوێ بەکاری گرنگ دەژمێردرێن بەڵام بە مەرجی بوونی بنکەکانیان لەنێو خودی کورستاندا. ئا لەم کاتەدا بەری خەبات وەدی دێت. لە هەمووی گرنگتر ئامادەبوونە بە چاکترین پلەو بە پێی توانا. هەروەك لە سەرەتاوە وتمان مەسەلەی پەیوەندییەکان بە حساب کردنە. پەیوەندییەکان مەترسییەك ناهێننە ئاراوە ئەگەر جۆرە کێش و پێوان و هاوکێشەییەك هەبێت.

د-چالاکی زانستی جیاوازە لەگەڵ چالاکی ڕامیاری. بە بێ دانوستاندن چالاکی سیاسی ئەنجام نادرێت. هەندێك جار دوژمن چۆك دەداو هەندێك جاریش تۆ بۆ دوژمن. سیاسەت بەم شێوەیە گەشە دەکات لە زانستدا چۆکدادان نییە. پێویستە چەمکەکان (سەبك) لە شوێنی ڕاستی خۆیاندا دابنرێن. پەیوەندی نێوان دیاردەکان بە شێوەیەکی ساغ بنیات دەنرێن. نابێ دیاردەکان نەبینرێن یا چاوپۆشییان لێبکرێ پێویستە لەسەر ئەوانەی کە بە لێکۆڵینەوەو لێتوێژینەوە ڕادەبن بە تەواوی سەربەخۆو ئازادبن لە ڕووی ئەقڵی و بیرکردنەوەیان. نابێ هیچ چۆك دادانێك ئەنجامبدرێت لەم بوارەدا. لەبەرئەوە پێویستە جیاوازی بەدیار بخرێ لە نێوان ئەو کەسانەو دەزگایانەی کە بە چالاکی زانستی ڕادەبن و ئەو کەسانەو دەزگایانەی کە بە چالاکی ڕامیاری ڕادەبن هەروەها پێویستە لەسەر ئەو کەسانەو دەزگایانەی کە بە چالاکی ڕامیاری ڕادەبن خۆ دوورەپەرێز بگرن لە سەرکردایەتی ئەو کەسانەو دەزگایانەی کە بە چالاکی زانستی ڕادەبن. ئەو کەسانەی کە بە چالاکی زانستی هەڵدەستن پێویستە سەربەخۆیەتی خۆیان بپارێزن لە بەردەم دامەزراوە سیاسییەکاندا. ئەم هەڵوێستە بۆ کوردەکان زۆر پێویستە.

ه-پێویستە هەڵوەستەیەك لەسەر چەمکی (نەتەوە)ی کوردیش بکەین نەتەوەی کورد جیاوازە لەگەڵ نەتەوەی تورك و عەرەب و فارس. ئەم جیاوازییەش زۆر گەورەیەو بە ڕادەیەك ناتوانرێ یەکێتی لە نێوانیاندا سازبکرێت. نەتەوە لە ئەورووپاو جیهانی ڕۆژئاوادا بووەتە (تەیار)ێکی ناهاوچەرخ. لە هەمان کاتدا نەتەوە هێشتا زۆر بەهێزە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیاو ئەفریقاو شوێنە لە یەکچووەکانی تریش. هەر بۆ نموونە تا ئێستاش هەستی نەتەوەیی و بزووتنەوە نەتەوەییەکان گەلێ بە هێزن لای عەرەب و تورك و فارسەکان. ناوەڕۆکی ئەم بزووتنەوانەو ئایدیۆلۆژیانە جیاوازییەکی مەزنیان هەیە لەگەڵ ناوەڕۆکی نەتەوەی کورد.

کوردەکان بۆیان نییە هەستی نەتەوەیی خۆیان دەربڕن. کوردەکان لەژێر پاڵەپەستۆو زۆرلێکردندا دەناڵێنن. ناوەڕۆکی بزووتنەوەی کوردی بە تەواوی دیموکراتییە، چونکە بەرگری لە خۆی دەکات دژی ئیمپریالیزم و زۆلێکردنی تورکی و عەرەبی و فارسی. دیموکراتی و شۆڕشگێڕی بەم بەرەنگاربوونەوەیە بەستراونەتەوە. لەبەر ئەم هۆیە بەرگری کردن لە هەستی نەتەوەیی و خاسیەت و نرخە نەتەوەییەکان بە یەکێ لە مەرجە بناغەییەکانی دیموکراتی و شۆڕشگێڕی دادەنرێت بۆ کوردەکان. نەتەوەی کورد لە جەوهەرو ڕێبازدا دەستدرێژکاری تێدا نابینرێت. بەڵکو نەتەوەپەرستەکانی تورك و عەرەب و فارس دەستدرێژکارن. سروشتی بزووتنەوە نەتەوەییەکانی تورکی و عەرەبی و فارسی ناواخنەکەی ئیمپریالیزمانەیە. بە تەواوی و بە پێچەوانەوە نەتەوەی کورد هەوڵدەدات بۆ ڕزگاربوون لە ئیمپریالیزم و ئامانجی یەکسانی بوونە لەگەڵ تورکەکان و عەرەبەکان و فارسەکان وە هەوڵدەدان بۆ ڕزگارکردنی کوردەکان لە هێرشە دڕندەکان.

لێرەدا ڕایەکی هەڵە هەیە لای شۆڕگێڕە کوردەکان. کاتێ مرۆڤ باسی نەتەوەی کوردو هەستی نەتەوەیی دەکات، ئەوان وا تێدەگەن کە دەرەبەگ و هۆزەکان و شێخ و ئاغاو موڵکدارەکان دەگرێتەوە. وا تێدەگەن کە نەتەوەو خاسیەتەکانی نەتەوەیی تایبەتە بە وان. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە. نەتەوەی میللەتێکی ژێردەستەی زۆرلێکراو نابێتە بەرهەڵستی بەرژەوەندییەکانی چینە زەحمەتکێشەکان. ئەم نەتەوەیە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی چینە زەحمەتکێشەکان یەکدەگرێتەوە. چونکە تا ئێستا دەرەبەگ بگۆڕێ بۆ چینێکی بۆرژوازی لە کوردستان. پێش ئەوەی کە دەرەبەگ نەگۆڕاوە بۆ چینێکی بۆرژوازی دەوڵەت کردی بە نۆکەر. لەبەرئەوە دەرەبەگ وەك چینێك پلەو پایەیەکی وەهای نییە تا بە نەتەوە بنازێ. تێگەیشتنی هەڵەی نەتەوەو هەستی نەتەوەیی لای شۆڕشگێڕە کوردەکان لەژێر کارتێکردنی چەپی تورکی لەدایك بووە. چەپی تورکی هەمیشە بزووتنەوە کوردییەکانی بە بزووتنەوەی نەتەوەیی ناو دەبردو بە نەتەوەیشی تاوانبار دەکرد. ئەم ڕەخنەگرتنەش لە بناغەوە بە گوێرەی ئایدیۆلۆژی ڕەسمی هاتۆتە کایەوە. بۆ نموونە شۆڕشی شێخ سەعید (1925) وەك بزووتنەوەی نەتەوەیی ڕەخنەی لێ نەگیرا بەڵکو وەك بزووتنەوەیەکی ئایینی. ئامانجی ئەم ڕەخنە گرتنەش نەهێشتن و لاوازکردنی هەستی نەتەوەیی کوردی بوو. چونکە کەمالیزم دژی هەموو شێوەکانی بزووتنەوە کوردییەکانە. چەپی تورکی لە شەستەکان و حەفتاکاندا بزووتنەوە کوردییەکانی بە نەتەوەیی لە قەڵەم دەداو بە شۆڕگێڕی نێونەتەوەیی نەدەژمارد. لە بنچینەدا ئەوانەی کە دروشمی نەتەوەیی بەرزدەکەنەوە چەپە تورکەکان خۆیانن. با ساڵەکانی شەستەکان و حەفتاکان بێنینەوە یادو ئەو دروشمانەی کە زۆر شۆڕشگێڕی باو بوو لە خۆپیشاندانەکان بریتی بوو لە دروشمی (تورکیای سەربەخۆ). ئەوان بیریان چۆتەوە کە چۆن (تورکیای سەربەخۆ) دامەزرا. ئیمپریالیزمی بەریتانی و فەڕەنسی و کەمالیزم و میرنشین و شێخ نشینە عەرەب و فارسەکان لەگەڵ یەکدا کوردستانیان دابەش و پارچە پارچە کردو ئا لەم کاتەدا بەشێکی گەورەی کوردستان کەوتە نێو سنووری

دەوڵەتی تورکیای تازە. کەواتە تورکیا چۆن دەتوانێت سەربەخۆ بێت لەسەر بناغەی سیاسەتی ناکۆکی ئانەوەی ئیمپریالیزم. چەپە تورکەکان هەرکات بانگەشەی ئەم دروشمەیان کردووە. لە کاتێکدا هەموو داوا کوردییەکانیان بە نەتەوەیی تاوانبار کردووە. بە ڕاستی ئەمە مەخسەرەیە. ئەم کارە لە شەستەکان و حەفتاکان ئەدۆزرایەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئەکەوتنی هەستی کۆمەڵایەتی و مێژوویی کوردەکان لەوکاتەدا. (وەڵامی ئەوانیان ئەداوە بەوەی کە هاوکاریان کرد لەگەڵ ئیمپرالیزم بە مەبەستی دابەشکردن و پارچە پارچە کردنی کوردستان). کەمالیزم هەتا ڕادەیەکی زۆر کاری کردە سەر چەپی تورکی.

لە لایەکی ترەوە چەپی تورکی هەر لەو ساڵانەدا بەرگری لە مافەکانی گەلی ڤێتنامی و فەلەستینی و نیکاراگوایی و ئەنگۆلی دەکرد لە مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ بۆ خۆیان. بەڵام هەڵوێستیان بەرامبەر بە کوردەکان بە شێوەیەکی تر بوو نە تەنیا بەرگرییان لە مافی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ نەدەکرد، بەڵکو هەتا قسەکردن بە زمانی کوردیشیان بە هەڵەیەکی گەورە دەزانی. هەتا شۆڕشگێڕە کوردەکانیش بۆ ئەوەی نەبنە ئامانجی بیانووەکانی چەپی تورکی وەك ئەوان پارێزگاریان لە زمانی کوردی و ئەدەبی کوردی و کاروبارەکانی گرێدراو بەم مەسەلەیە نەدەکرد. لە هەمان کاتدا خۆیان بە مارکسی و لینینی و نێونەتەوەیی دەژمارد.

لە ڕۆژی ئەمڕۆدا هەتا مافی خوێندنی قورئان و لە دایکبوونی پێغەمبەر (مەولود) بووەتە کارێکی شۆڕشگێڕی. دەوڵەتی کۆلۆنیالیست و شۆڤێنی بەرهەڵستی و هێرشی هەر شتێکی کوردی دەکات. دەیەوێت هەر شتێك کە پەیوەندی هەیە بە کوردەکان لە ڕەگ و ڕیشەوە دەربکێشێت. هەموو شێوازێك دەگرێتەبەرو یاسا دێنێتە ئاراوە لە پێناوی لە بەین بردنی زمان و کەلەپووری میللی و مۆسیقای کوردی. ئەدانی بایەخی پێویست بەم مەسەلانەی سەرەوە کە باسکران و جەخت نەکردن لە سەریان و هێنانەوەی بەهانەی (ئێمە شۆڕشگێڕو نێونەتەوەیین) تەنیا دەبێتە خزمەتکردنی ئیمپریالیزمی تورکی و بەس بەرهەڵستی و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕەگەزپەرستی و ئیمپریالیزمی تورکی دەگەیەنێت.

تێگەیشتنی کوردەکان بۆ نەتەوە پێویستە جیاوازی هەبێت لەگەڵ تێگەیشتنی تورکەکان و عەرەبەکان و فارسەکان بۆ هەمان مەسەلە. نەتەوەی عەرەبی و فارسی و تورکی دەست درێژکەرو ناحەزانەو تۆوی ئیمپریالیزمیان پێوە دیارە. نەتەوەی کوردی پارێزگاری میللەتی کورد دەکات لە پێناوی بەدەستهێنانی هەر هەمان ئەو مافانەی کە تورکەکان و عەرەبەکان و فارسەکان هەیانەو پاراستنی گەلی کورد لە بەرامبەر هێرشەکانی نەتەوەی دوژمن و ئیمپریالیزم و ڕەگەزپەرستی. نەتەوەی کوردی ناوەڕۆکێکی دیموکراتیانەی هەیە چونکە بەرەنگاری ئیمپریالیزم و داگیرکەری ڕەگەزپەرست دەبێتەوە.

کاتێ کە لە گۆڕانکارییە نوێکانی ئەورووپاو بازاڕی هاوبەشی ئەورووپا بڕوانین دەبینین کە نەتەوەو بزووتنەوە نەتەوەییەکان نا هاوچەرخن. ئەورووپا بەرەو یەکێتی هەنگاو دەنێت و ئەمەش کارێکی سروشتییە، ئەم کردارە شێوەیەکی تری هەیە لە کوردستان. لە کوردستان زۆر لێکردن و سەرکوتکردنەوەیەکی گەورە لە ئارادایە. پێویستە لەسەر کوردەکان چەمکی نەتەوە سەرلەنوێ هەڵبسەنگێنن. نابێ پێوانەی چەپی تورکی بۆ نەتەوە وەك پێوەر پەسند بکرێت. پێویستە تێگەیشتن و دەرك پێکردنی کوردەکان سەربەخۆو تایبەت بە خۆیان بێت. ئەوەی کە کوردەکان پێویستیان پێیەتی بیرو هەڵوێستی مارکسیزم لینینزم نییە بەڵکو هەستی نەتەوەییە. نموونەیەك لەسەر لاوازی هەستی نەتەوەیی دەخەمە بەرچاو. یەکێ لە هاوڕێیان بۆی گێڕامەوە: زانایەکی ئەرکیۆلۆژی چووە ئەفریقا. وێنەو نەخشەی کێشراوو هەڵکەنراوی سەر دارەکان سەرنجی ئەوی ڕاکێشا. کاتێ ئەم زانایە ویستی دەست بگرێ بە سەریاندا تووشی بەرهەڵستییەکی سەختی دانیشتوانی ناوخۆی ئەم شوێنە بوو: (دەست لە هیچ بەردێك و چڵ و لقی دارێك مەدە. ئەوانە موڵکی ئێمەن و میراتی باب و باپیرانمانە.) پاشان بە دارو بەردو تیرو کەوان هێرشیان کردە سەر زانای ناوبراو. دوای ماوەیەك هەر هەمان زانای فەرەنسی چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامدا لە ناوچەکانی دەروبەری ڕووباری دیجلەو فورات، لەوێ دانیشتووە کوردەکان یارمەتی زۆریان دا. هەتا بەردی بەنرخ و فەخفوری وێنە لەسەر کێشراویان لە بەردەم دانا: (ئەم شتانەش لەگەڵ خۆت ببە)و بەبێ پارە. کاتێ زانای فەرەنسی چەند لێکۆڵینەوەیەکی ئەنجامداو دوای ئەوە بیری ئەوە دەکاتەوە لە ئەفریقا چی بەسەر هاتووە دەڵێت: (هەستی نەتەوەیی و خۆبەستنەوە بە نیشتمان لای کوردەکان لاوازە. هەموو شتێك کە شکیان پێدەبرد دایان بە من. نەترسان و نەشیانزانی کە ئەم شتانە لە نیشتمانیان بزر دەبێت. نەیانزانی ئەم شتانە بەڵگەنامەن لەسەر مێژوو و ڕابردوویان). کاتێ باس دێتە سەر هەستی نەتەوەیی پێویستە ئەرمەنەکان و جوولەکان یاد بکەینەوە. ئەم نەتەوانە گەلێ جار زۆرلێکردنیان دیوە لە مێژوودا. دەرهەقی ئەوان قەسابخانە بەرپاکراوەو لە نیشتمانی خۆیان وەدەرنراون، بەڵام ئەوان قەت قەت ئەم قەسابخانانەیان لەبیر نەچۆتەوە. بەهێزیی هەستی نەتەوەیی ماوەی ئەوەیانی نەداوە کە (نەتەوەیی)یان بزر بێت. لە کاتێکدا دەبینین کوردەکان زۆر بە ئاسانی ئەو زۆرلێکردن و قەسابخانانەی کە دژیان ئەنجامدراوە لەبیردەکەن. لاوازی هەستی نەتەوەیی لەم نموونەیەدا زۆر ئاشکرایە.

ز-پێویستە بیر لە مەسەلەیەکی تریش بکەینەوە. تا ئێستا شۆڕشگێڕە تورکەکان گفتوگۆ لەسەر مەسەلەیەك دەکەن ئایا کوردستان کۆلۆنی (موستەعمەرە)یە یان نا؟ گفتوگۆی ئەوە دەکەن ئایا پێویستە لەسەر کوردەکان بە شێوەیەکی سەربەخۆ خۆیان ڕێکبخەن یان نا؟ ئەم گفتوگۆیانە تا ڕۆژی ئەمڕۆش بەردەوامە.. بە ڕاستی جێگای داخە کە مقۆمقۆی ئاوەها لە گۆڕێدایە.. بەڵام بە بڕوای من پێویستە بە شێوەیەکی چاك لەم مەسەلانە بکۆڵینەوە.

ئایا کوردستان موستەعمەرەیە یان نا؟ نە بە تەنێ موستەعمەرەیەو بەس بەڵکو لەوەش زیاترەو تا دەگاتە پلەی دەستدرێژی کردنی سەر ئابڕوو ناموس. وشەی شەرەف وشەیەکی زانستی نییە بەڵکو ڕەوشتییە. باسکردنی ئازاری کۆمەڵگای کوردەواریی بە شێوەو چەمکی زانستی لە تواناادا نیە. وشە زانستییەکان بەشی باسکردن ناکەن. لەم ساڵانەی دواییدا زۆر وشە هاتۆتە ئاراوە کە باسی ڕاستی یا وەسفی دەکەن. بۆ نموونە وشەی (کەوتن) وشەیەکی لەم جۆرەیە کە هەڵبەتە کوردستان کۆلۆنی تورکییە

دەڵێن: (تورکیا بە خۆی نیو کۆلۆنی ئیمپریالیزمە. دەوڵەتێکی نیوەداگیرکراو چۆن دەتوانێ ببێتە خاوەنی کۆلۆنی و داگیرکەر). دیارە تورکیا تەنیا ئەوەی کەمە کە ببێتە داگیرکەر. سوپاو هێزی پۆلیس و بنکەی پۆلیس و دادگاو سازمانی ئاسایش زۆر دەزگای سەرکوتکەری تر لە تورکیا هەن. میکانیزمی بەڕێوەبردن و مووچەخۆران و کارمەندان هەن. ڕۆژنامەو گۆڤارو ڕادیۆو تەلەفزیۆن و گشت هۆیەکانی ڕاگەیاندن هەن. ئایا سەرکردایەتی دەوڵەتی بۆرژوازی ئەزموون و زانیاری لەبەردەستدا نییە لە بوارەکانی بازرگانی و پیشەسازی بە مەبەستی گۆڕینی کوردستان بۆ موستەعمەرە؟ ئایا سەرمایەی گردەوەبووی پێویستە؟.

ژمارەی لەشکری تورکی لە هەشت سەد هەزار سەرباز تێپەڕ دەکات و شوێنی دووەم دەگرێتەوە لە ناتۆ دوای سوپای ئەمریکی. پۆلیس و جەندرمەو هێزی تایبەتی و سازمانی ئاسایش و بەکرێگیراوو سیخوڕەکانیان زۆرو زەبەندن. بنکەکانی هێزی تایبەتی و زۆری تر. دەوڵەت خاوەنی نزیکەی هەزار زیندان و گرتووخانەیە. خاوەنی هێزی ئاسایشە. کاتێ کە ئەم بنکەر

بارەگایانە دروست دەکەن داوای مۆڵەت لە ئەمریکا ناکەن. دەوڵەتی تورکیا ئەم دامودەزگایانە دروستدەکات و سەرکردایەتیان دەکات. نابێت بەراوردی دەوڵەتی تورکی لەگەڵ دەوڵەتانی ئەفریقاو دەوڵەتانی ئەمریکای ناوەڕاست و ئەمریکای باشوور بکەین کە تەمەنیان ناگاتە زیاتر لە بیست سی ساڵێك یا پەنجا شەست ساڵێك یا هەتا سەد ساڵێك. دەوڵەتی تورکی بەردەوامی ئیمپراتۆری عوسمانییە. تەمەنی بە تەنێ لە ئەنادۆڵ و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگاتە زیاتر لە هەزار ساڵ. دەزانین میکافیلی چی لە کتێبەکەی خۆی (میر) نووسیوە. لە پێش ئەویش وەزیری سەلجوقییەکان (نیزامولمەلیك) لە سەدەی یازدەهەم شتێکی وەك ئەوی (میکافیلی) نووسیوە لە کتێبەکەی خۆی (سیاسەتنامە).

بۆ ئەوەی کە تورکیا ببێتە دەوڵەتێکی ئیمپریالیزمی پێویستی بە مۆڵەت و خواستن و زانیاری لە ئەمریکایی و ئینگلیزەکان نییە.. زیندانەکانی تورکیا پڕن لە زیندانییە سیاسییەکان. لەبەرئەوە ئەو پێویستی بە زانیاری ئەمریکایی و ئینگلیز نییە. لەم بارەیەوە تورکیا خاوەنی ئەزموون و شارەزاییەکی دوورو درێژە.

مەنتیقی (داگیرکردنی کۆلۆنی و داگیرکردنی نیوە کۆلۆنی) بۆش و بێ مانایە. بە کورتی باسی ئەوەمان کرد کە تورکیا نیوە موستەعمەرەشی هەیە. سوپاو هێزی پۆلیس و دادگاو هۆیەکانی ڕاگەیاندن و زانکۆکان و دەزگاکانی پەروەردەو بەڕێوەبەرایەتی ئەمن و ئاسایش و زۆری تر. ئایا کوردەکان لە بەرامبەر ئەمانە چ شك دەبەن؟ تورکیا هەرچەندە نیوە کۆلۆنییەو خاوەن ئەم هەموانەیە، ئاخۆ دەبێ چ دەربارەی کوردەکان بگوترێ کە هیچ شتێك شك نابەن. نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە تورکیا هەتا خاوەن گشت کارگەکان و پیشەسازگەکانە کە لە کوردستاندا هەن.

بێگومان کوردستان کۆلۆنی تورکییە. زۆرلێکردن و بڕینەوەی زۆرو شێوە هەرە درندەکانی ئیمپریالیزمی و قەسابخانە گشتییەکان کە لە کوردستان ئەنجام دران لە سەردەمی مستەفا کەمال بوو، لەو ماوەیەدا کە تورکیا لەژێر دەستی ئیمپرالیزم ڕزگاری بوو بوو.

بابەتێکی تر هەیە کە پەیوەندیدارە بە بابەتی ئایا کوردستان کۆلۆنییە، ئەویش بابەتی ڕێکخستنی کوردەکان و بەڕێوەبەرایەتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی و شۆڕشگێڕی و ئەو مەسەلانەی کە تایبەتن بەم بابەتەوە. بابەتی (کوردستان کۆلۆنییە) چەپە کوردەکان لە چەپە تورکەکان جیادەکاتەوە. زۆربەی زۆری چەپە کوردەکان بیرۆکەی کوردستان کۆلۆنییە پەسند دەکەن. بەڵام بە پێچەوانەوە بەشێکی گەورەی فراوان بوونی جەنگی پارتیزانی و پێشکەوتنی بیروباوەڕی پارتیزانەکانیش بە خۆیان ئەم مەسەلەیە زیاتر میللی بوو و بەرز بووەوە لەنێو جەماوەردا. بەم شێوەیە ژمارەی ئەو کەسانەی کە بوونی ئیمپریالیزم دەسەلمێنن ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبووندایە. وا بڕوا دەکەم کە بیرۆکەی (موستەعمەرە) چەمکێکی باشە بۆ ڕوونکردنەوەی بنیاتنانی کۆمەڵ و پێشکەوتنی مێژوو. چونکە چەپی تورکی خۆی بێبەش کردبوو لە وەرگرتنی ئەم چەمکەو تێگەیشتنی ڕاستی بۆ پێشکەوتن. بیرۆکەی کوردستان کۆلۆنییە، بەستراوە بە مەسەلەی چۆنیەتی ڕێکخستن. ئەوەی کە بیرۆکەی ئیمپریالیزم پەسند بکات ئەوا بیرۆکەی سەربەخۆیەتی ڕێکخستنیش پەسند دەکات. ئەم شتەش کتومت ئێستا ڕوودەدات. چەپی تورکی بە لاساری و گەرمییەوە هەوڵی ئەوەیداوە کە ڕێکخراوەکانی خۆی بسەپێنێت بەسەر کوردەکانداو شێوەی ئەم پەیوەندییەش بە تەنێ لە کوردستان هەیە. ئەم پەیوەندییە لە نێوان چەپی گەلی سەردەست و چەپی گەلی بندەستدا خۆی دەنوێنێت. مرۆڤ لە شوێنێکی تردا ئەم جۆرە پەیوەندییانەی بەرچاو ناکەوێت.

با لە پەیوەندی نێوان بزووتنەوەی ئازادیخوازی فەلەستین و ئیسرائیل وردببینەوە. هیچ شۆڕشگێڕێکی ئیسرائیلی و کۆمۆنیستی جوولەکە پێشنیاری ڕێکخستنی هاوبەش لەگەڵ فەلەستینییەکان ناکات. فەلەستینیەکانیش داوای ڕێکخستن ناکەن لەنێو چوارچێوەی پارتی کۆمۆنیستی ئیسرائیل، چونکە ڕێکخراوی فەلەستینی سەربەخۆ لەو زەوییانەی کە ئیسرائیل داگیری کردوون لە ئارادایەو لە لایەکی ترەوە ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێت کە پارتی کۆمۆنیستی ئیسرائیل پارتێکە دەتوانرێ پشتی پێ ببەسترێ و بڕوای پێ بکرێ و چاکترە لەو پارتانەی کە لەو دەچن و لە تورکیا هەن. پارتی کۆمۆنیستی ئیسرائیل پەیوەندی لەگەڵ بزووتنەوە فەلەستینییەکان دروستدەکات و گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات هەرچەندە کێشەی ئیسرائیل- فەلەستین لە گۆڕێدایە. ئەم پەیوەندییانەش بە ئاشکراو بە ئامادەبوونی هەموو هۆیەکانی ڕاگەیاندن ئەنجامدەدرێت. فەلەستینییەکان مافی ڕێکخراوەی سەربەخۆیان هەیە. ڕێکخراوەی سەربەخۆ بۆ کوردەکانی کوردستانی باشووروُ ڕۆژهەڵات گیروگرفت بۆ چەپی تورکی دروستناکەن. لەگەڵ ئەوەشدا پرسیان پێدەکەن و پاڵەپەستۆی ئەوەیان لەسەر دەکەن کە ڕێکخراوی هاوبەش پێکبێنن و دەڵێن (ئێونەتەوەیی و شۆڕشگێڕی پێویستیان بەم کارە هەیە). چەپی تورکی لە ساڵەکانی 1969-1970 ئەرکی نێونەتەوەیی خۆیان بەرامبەر بە فەلەستینییەکان ئەنجامداو بەشداریان کرد لە خەبات دژی ئیسرائیل و بۆیان هەبوو بە گوێرەی ئارەزووی خۆیان لەوێ بمێننەوە. هەندێك لەوان مەشقیشیان کردو بەشداری جەنگیشیان بە چاکی کرد لەوکاتەدا کەسێك لەوان باسی سەپاندنی پرۆگرام یا مەرج بۆ پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ فەلەستینییەکان بە وشەیەك چییە نەکرد. تێڕوانینی چەپی تورکی بەرامبەر بە کوردستان و بەرەنگاربوونەوەی دیموکراتی و شۆڕشگێڕی بە هەمان شێوەو ڕێگای ئەوان بۆ فەلەستینییەکان نەبوو و جیاوازی هەبوو. لە لایەنی ڕێکخراوەییەوە چەپی تورکی هیچ سودێکیان نەبووە بۆ کوردستان. تەنیا ڕێگەپێدانی ئەندامە کوردەکان بۆ ئەوەی لە ڕێکخراوەکانی خۆیان جیاببنەوەو بە تەواوی لەگەڵ ئەوان کاربکەن ئەمەیان بە باشترین خزمەت دەزانی.

کاتێ لە ئیمپریالیزم و ڕێکخراوەی هاوبەش دەدوێین نابێ ئەوەمان لەیاد بچێت کە کوردستان لە موستەعمەرەشی تێپەڕاندووە. کوردستان وڵاتێکی دابەشکراو و لەتلەتکراوە لە نێوان چەند دەوڵەتێکدا. کوردستان موستەعمەرەی نێودەوڵەتانە. داوای (یەکگرتنی شۆڕشگێڕە کوردەکان لە تورکیا لەگەڵ شۆڕشگێڕانی تورك، وە شۆڕشگێڕە کوردەکان لە ئێران لەگەڵ شۆڕشگێڕانی ئێرانی، وە شۆڕشگێڕە کوردەکان لە عێراق لەگەڵ شۆڕشگێڕانی عێراقی) داوایەکی شۆڕشگێڕانە نییە ئەم پێشنیارانە خزمەتی ئیمپریالیزم و داگیرکەران دەکەن.

بنەڕەت و ناوەڕۆکی مەسەلەی کوردی بەم جۆرەیە: مەسەلەی خاك و میللەتێکی دابەشکراو و پارچەپارچەکراو کە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و فەرەنسی و بەکرێگیراوە ناوخۆییەکان وەکو کەمالیستەکان و مۆنارکییە عەرەب و فارەسکان ئەم کارەیان دژی دروستکردنی دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ ئەنجامداوە. ئا ئەمەیە جەوهەری مەسەلەی کورد. نەخشەی ئەم پیلانە لە ساڵانی شەڕی یەکەمی جیهانی و ساڵانی 1919-1922 لەکاتی شەڕی تورکی- یۆنانی و شەڕی تورکی- ئەرمەنی کێشراوە، لەو کاتانەدا زۆر ڕووداو و کارو فرمانی نوێ هاتنە کایەوە کە هەریەکەیان کاریگەری خۆیان هەبووە. بۆ نموونە: تورکەکان، ئەرمەنەکان، عەرەبەکان، ڕوسیای تەزاری، شۆڕشی بەلشەفی، ئیمپریالیزمی ئینگلیزی و ئیمپریالیزمی ئەڵمانی، خەلافەتی ئیسلامی و خەلافەتی سوڵتان، ئەنوەر پاشا، مستەفا کەمال، کۆمەڵەی (اتحاد و ترقی)، هێزە نەتەوەییەکان. لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی ئەم ڕووداو و چەمکانەو پەیوەندییان بە مەسەلەی کوردەوە کارێکی پێویستە.

**تێبینی:**

**ئەمە بەشێکە لەو چاوپێکەوتنەی کە ڕۆژنامەی سەرخۆبوون لە 1990/11/29 لەگەڵ پێشکچی ئەنجامی داوەو یەکەمجار بە تورکی بڵاوی کردۆتەوەو پاشان کراوەتە عەرەبی و بەڕێز مهاباد کوردی لەگەڵ چاوپێکەوتنێکی دکتۆر عیسمەت شەریف وانلی کردویەتیە زاری سۆرانی**

# گفتوگۆیەك لەگەڵ
# دلاوەر زەنگی
# سەبارەت بە خەڵاتی عوسمان سەبری
# بۆ بێشكچی

دوا جار پاش دووساڵ لیژنەی خەڵاتی عوسمان سەبری توانیان خەڵاتی یەكەمیان ببەخشن بە زاناو بیریاری پێشكەوتنخوازی توركی ئیسماعیل بێشكچی. توێژەری كورد دلاوەر زەنگی لە 2000\7\12 لە ئەنقەرەی پایتەختی توركیا ئەم خەڵاتەی پێشكەش كرد

- **بۆچی لیژنەكەتان خەڵاتی خۆی بەخشی بە زانای بەناوبانگی توركی ئیسماعیل بێشكچی؟**

- ڕۆشنبیری دیموكراتی و خەباتگێڕی شۆڕشگێڕ ئیسماعیل بێشكچی كە نەوەی گەلی توركە یەكەمین كەسی بیانی‌یە كە ژیانی خۆی لە پێناوی سەربەستی كوردو كوردستاندا تەرخان كردووەو بەشێكی گەورەی ژیانی خۆی بەخۆڕاگری لەو پێناوەدا لە زیندانەكانی دەسەڵاتی توركیدا بەسەر بردووە. ئیسماعیل بێشكچی لەبەردەم خراپی و هەڵەكانی ئایدۆلۆژیای توركیدا دەستەوستان دانەنیشتووە بەڵكو لە زیندان و دادگاكانیشدا بەقسەی ئازایانەی ڕاستگۆیانە بەرگری كردووە. زیندان و دادگاكانی توركیا بەوەی كە هەموویان لە هۆیەكانی ئازاردانن نەیانتوانیووە دكتۆر بێشكچی لە ئامانجەكانی دوور بخەنەوە یان كار لە هەست و ویژدانی بكەن بەرامبەر بە گەلی كورد، هەروەها نەیانتوانیووە ئیرادەی بێشكچی لە بەرگری‌كردن لە ئاشتی و برایەتی گەلی كوردو تورك لاواز بكەن.

بێشكچی زیاتر لە دەیان جار بەهۆی بیرو باوەڕە پێشكەوتوە دیموكراتیەكەیەوە كە داواكردنی سەربەستی و یەكسانی‌یەو بەهۆی توێژینەوە زانستییەكانیەوە لەبارەی كوردو كوردستانەوەو دەوڵەمەندكردنی كتێبخانەی كوردی و كتێبخانەكانی كۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەدانراوە زۆرەكانی دەستگیر كراوە.

پرۆفیسۆر بێشكچی بەیەكێك لە هێماكانی ئاشتی و سەربەستی دادەنرێت لە جیهانداو بەرگریكەرێكی سەرسەختی مافەكانی گەلی كوردە. ئێمە زۆر بەكەمی دەبینین كەسێتیەكی بیانی ژیانی خۆی وەك بێشكچی تەرخان بكات بۆ كوردو قوربانی بەنرخ و گرنگ بدات لە پێناوی مەسەلەكەماندا، لەبەر ئەم شتانە هەموویان ئەم لیژنەیە بە شانازییەكی گەورەی زانی كە ڕێز لەم خەباتگێڕە شۆڕشگێڕە بنێت كە هاوڕێی بەوەفای گەلی كوردەو خەڵاتی پێببەخشێت.

- **ئایا لایەنی هاوبەش لە نێوان كەسێتی و ژیانی عوسمان سەبری و دكتۆر ئیسماعیل بێشكچی‌دا هەیە؟**

- ئەم دوو كەسێتیە گەورەیە كە پێكەوە خۆریان لە ئامێز گرتووەو لەگەڵ شارستانێتەكانی ڕۆژهەڵات و فەلسەفەكەیدا هۆگربوون. گۆرانی سەربەستیان چڕیوەو، سیمفۆنیای عیشق و گیانیان ژەندوە كە ئەویش هیچ سنوورێك ناناسێت. ئەم دوو پیاوە پێكی مرۆڤایەتیان نۆش كردووەو فرە ڕەنگ بوون، هەمان مەسەلەو هەمان چارەنووسیان هەیە، درێژەی ژیانیان زنجیرەیەكی دووری درێژە لە قوربانی دان و بەخشین و كاركردن لە پێناوی دۆزی گەلێكی چەوساوەو بێبەش و دەركراو لە زەوی و نیشتمانی خۆی. بێگومان دەبێ لایەنی هاوبەش لە نێوان كەسێتیاندا هەبێت.



پرۆفیسۆر بێشكچی لە نێوان ساڵانی 1962 بۆ 1999 زیاتر لە (20) ساڵ لە زینداندا بووەو بڕی (26) ملیار لیرەی توركی سزا لە دادگا لەسەر دانراوەو دەوڵەتی توركی (27) دەعوای لای دادگا بەدژی تۆمار كردووەو ئێستا حوكمی (200) ساڵ زیندانیكردنی بەسەردا دراوە.

بێشكچی توێژینەوەی زانستی لەبارەی كوردو كوردستانەوە هەیەو لەم بواردا زیاتر لە (18) كتێبی هەیە، لەگەڵ كتێب لەسەر زمان و ئەسڵی زمانی كوردی- هەروەها هانی كوردەكانی داوە كە بەكوردی بدوێن و بنووسن و مێژووی خۆیان تۆمار بكەن و پارێزگاری دابونەریتی خۆیان بكەن و پەیوەست بن بە فۆلكلۆری خۆیانەوە لە ترسی ئەوەی نەوەكو لەناوبچێت. بێشكچی خەباتگێڕێكی پتەو ئازاو بوێرو ڕاستگۆیە لە كارو كردەوەیدا، شۆڕشگێڕو پێشكەوتن خوازێكە بڕوای بەخەباتی چەكداری هەیە وەكو ڕێگایەك بۆ ڕزگاری گەلی كورد لە چەپۆكی داگیركەر.

بەڵام خەباتگێڕی شۆڕشگێڕو پێشكەوتنخواز عوسمان سەبری لە ساڵی 1946 تا 1973 هەژدە جار دەستگیر كراوەو زیاتر لە (12) ساڵی لە زینداندا بەسەر بردووەو لەلایەن دەوڵەتی توركەوە دووجار فەرمانی لە سێدارەدانی بەسەردا دراوەو چەندین جار دوور خراوەتەوە. عوسمان سەبری شاعیرو زمانەوان و سیاسیەك بووە گەواهی چاكەو خەباتگێڕی و سیفاتی مەردانەی وەكو نیشتمانپەروەرێكی ڕاستگۆیانەو ئازایەتی دەگمەنی بۆ دەدرێت لەگەڵ ڕاستگۆییەكی نموونەیی لە كارو كردەوەدا. عوسمان سەبری بەردەوامبوو لە فێركردنی زمانی كوردی‌دا چەندین نەوەی لە لاوانی كورد بە كوڕو كچەوە فێری ئەم زمانە كردووە كە ماوەیەكی دوورو درێژ جەنگی بەدژ ڕاگەیاندراوە. لە بورای زمان و مێژوو فۆلكلۆرو داب و نەریتی كوردی‌دا نووسراوە، عوسمان

سەبری خەباتگێڕێکی شۆڕشگێڕی پێشکەوتنخواز بوو. بڕوای بەخەباتی چەکداری هەبوو وەك ڕێگای ڕزگار کردنی گەلەکەی لە چەپۆکی داگیرکەر. نەبێشکچی و نە عوسمان سەبری ڕۆژێ لە ڕۆژان هەوڵیان نەداوە سامان و ناوبانگ بەدەست بهێنن هەردووکیان خاسیێتی بەهای خەباتگێڕانی شۆڕشگێڕانی دژی زوڵم و زۆرو دواکەوتوویی و کۆیلایەتی یان هەبووە.

- **بۆچی بێشکچی ئەم خەلاتەی بەتایبەتی وەرگرت، لە کاتێکدا پێشتر چەند خەلاتێکی ڕەت کردبووەوە؟**

- پرۆفیسۆر بێشکچی زۆر خەلاتی لە ڕێکخراو یەکێتی یە حکومی و نا حکومیەکانەوە پێ بەخشراوە. بەلام هەموویانی ڕەتکردووەتەوەو تەنانەت قبوڵی نەکردووە تەنیا یەکێکیشیان وەربگرێت. ڕازی بوونی دکتۆر بێشکچی بۆ وەرگرتنی خەلاتەکەی ئێمە دادەنرێت بەیەکەم خەلات کە بێشکچی ڕازی بووە وەری بگرێت.

ئەمەش لەخۆیدا دەستکەوتێکی گەورەیە بۆ ئێمەو شەرەفێکی گەورەیە بۆ مەسەلە ڕەواکەمان و شانازییەکی گەورەیە بۆ ئێمەو شەرەفێکی مەزنە بۆ من جارێکی تریش بێشکچی شۆڕشگێڕی خەباتگێڕ تەئکیدی لەسەر وەستانی لەگەڵ مەسەلەی میللەتەکەماندا کردەوە لەگەڵ پشتگیری بۆ ڕەوایەتی خەباتەکەمان. ئەمەش دەلالەتی دڵسۆزی و وەفا دارییەتی بۆ بیرو باوەڕی جێگیری سەبارەت بە مەسەلەی کورد. ئەم ڕازی بوونەی بێشکچی بۆ قبوڵکردنی ئەم خەلاتە دەنگدانەوەیەکی گەورەی هەبوو لە هەموو ناوەندە ڕۆشنبیری و سیاسی یەکانی جیهاندار ئەم هەواڵە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی و بیانیەکانی داگیرکردو بایەخێکی ڕاگەیاندنی گەورەی لە هەموو لایەکەوە بەدەست هێنا.

بۆ ئاوهێنانی ئەو خەلاتانەی کە ڕەفزی کردوون بەڕێز لانمارا لارا ماریش سەرۆکی لیژنەی خەلاتی ((پشتگیری بۆ دەربڕینی ئازاد)) پێ بەخشی، بێشکچی وەکو بەرگریکەری مافەکانی کورد ڕەتیکردەوە بەهۆی بەردەوام پیادەکردنی سیاستە زۆرداریەکانەوە دژی کورد. هەروەها یەکێتی نووسەرانی نەرویج سالی 1995 خەلاتی (بیری ئازاد)ی دایە بەلام دیسان ئەویشی ڕەتکردەوە. دیسان یەکێتی نوسەرانی ئەمەریکا خەلاتێکی دایە لەگەڵ بڕێکی گەورە لە پارە بەلام بێشکچی ڕەتیکردەوە، هەروەك ئەوەشی ڕەتکردەوە کە خەلاتی یەکێتی نوسەرانی ئەڵمانیاش وەربگرێت لەبەر پشتگیری کردن و یارمەتی دانی حکومەتی ئەڵمانیا بۆ حکومەتی تورکیا بەچەك کە ئەویش بزوتنەوەی کوردی پێ سەرکوت دەکات.

بەلام خەلاتەکەی ئێمە یەکەم خەلاتە کە لەلایەن بێشکچی یەوە قبوڵ بکرێت، ئەمەش شانازییەکی گەورەیە بۆ ئێمەو بۆ کێشە ڕەواکەمان. لە ڕاستیدا کاتێ لە ئۆفیسەکەی خۆی پێشوازی لێکردم لە سەرەتاوە بیری خستمەوە کە ئەو تاکو ئێستا هیچ خەلاتێکی قبوڵ نەکردووە. ئەو قوربانیەکان و خەباتی مامۆستا عوسمان سەبری بەرز نرخاندو زۆر ڕێزی لێدەگرێت. پێم گوت ((خەلاتەکەی ئێمە خەلاتێکی مەعنەوییەو مادی نییە، ئێمە لیژنەی خەباتی ڕێزلێنانی عوسمان سەبرین. تۆمان هەڵبژاردووە بۆ یەکەم خەلاتمان لەبەر ئەوەی تۆ یەکەم کەسی غەیرە کوردیت کە ژیانی خۆی تەرخان کردبێت لە پێناو مەسەلەکەماندا و بەشێکی زۆری ژیانی خۆی بە خۆڕاگری لە زیندانەکانی دەسەلاتدارانی تورکیا بەسەربردووەو هەوڵت نەداوە بەدوای دەستکەوتنی پارەو ناوبانگدا بڕۆیت. بەڵکو هەوڵت داوە لە پێناوی ئامانجی بەرزو پیرۆزدا. وکو وەفاو خۆشەویستی و ڕێز لێنان ئێمە بۆ هەوڵ و کۆششەکانت. بۆ خەباتی پالەوانیانەت ئەم خەلاتەت پێ دەبەخشین بەو ئومێدەی لێمان وەربگریت" دوای لێبوونەوەی لە قسەکردن، زەردەخەنە گرتی و کەمێ بەپێشەوە چەمایەوە وەکو دەربڕینی ڕەزامەندی و قبوڵکردنی.

بەگەرمی تەوقەمان کردو پێی گوتم ((من خەلاتەکەتان قبوڵ دەکەم بەخێربێن بۆ ئۆفیسەکەم سلاوم بگەیەنە بەهاوڕێکانت. داوای سەرکەوتن و بەرەو پێشەوە چوونتان بۆ دەکەم))

- **چ شتێکت لە کەسیتی پرۆفیسۆر بێشکچیدا بەدی کرد دوای پێ گەیشتنی بۆ پێدانی خەلاتەکە؟**

- قسەکردن لەبارەی پیاوێکی گەورەی وەکو بێشکچی یەوە گرانەو ئاسان نییە ئەو لەوە گەورەترە من ئەم قسانەی لەبارەوە بکەم و لەوەش گەورەترە کەمن لە کەسیتی دا بینیم، ئەو پیاوی زانست و زانیاری یە، زۆر سادەیە. کەم دەدوێت. دەموچاوی گەش و کراوەیە. زمانی شیرینە ڕاستگۆیە لە کارو کردەوەدا، دڵسۆزە بۆ بیروباوەڕەی خۆی، ڕێزی ڕاو ڕای ئەویتر دەگرێ. ڕەخنەو ڕەخنە لەخۆگرتن قبوڵ دەکات. ئەو پیاوی ئاشتی و دیموکراتی و برایەتی گەلانە- ئازانێت بەزین چییە. لەبەردەم تەنگ و چەڵەمەدا خۆڕاگرە. پێشکەوتنخوازو شۆڕشگێڕە لە خەباتیدا چاکەو خۆشی بۆ هەموان دەوێت و خۆشی دەوێت. بەڕاستی پیاوێکی مەزن و گەورەیە.

- **وەرگرتنی خەلاتەکەی بێشکچی بایەخێکی زۆری لەلایەن ڕاگەیاندنی کوردییەوە بەدەست هێنا هەروەها پێشوازییەکی گەورەی لێوە کرا لەلایەن ڕۆشنبیرانی دیموکراتییەوە لە تورکیا مەدلولاتی ئەمە چییە؟**

- وەك دەزانن من لیژنەکە داوای لێکردم کە خەلاتەکە پێشکەشی بێشکچی بکەم کاتێ گەیشتمە ئەنقەرە پەیوەندیم بە زۆر لە ڕۆشنبیران و سیاسیەکانی کوردەوە کرد لەوێ. لە سەروی هەموشیانەوە حیزبی HAPو سەرۆکی پەیمانگای کوردی لە ئەستەمبوڵ و نوێنەری مەلبەندی ڕۆشنبیری کوردی و نوێنەری یانەی کوردی و ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆشنبیرانی کورد تێڕوانینی گشتی ئەم کەس و لایەنانە ئەوەبوو کە بێشکچی خەلات لەکەس وەرناگرێت واتە پێویست ناکات گفتوگۆی ئەوەی لەگەڵدا بکرێت. هەموویان چاودێری ڕووداوەکەیان بەوردی دەکردو دوای بینینی و قبوڵکردنی خەلاتەکەو وەرگرتنی لێم بەخۆشیەوە هەموو سەرسام بوون نەك تەنیا لەسەر ئاستی تورکیا بەڵکو لەسەر ئاستی هەموو جیهان لەبەر ئەوە هەموو هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی بینراو بیستراوو خوێندراوە بایەخی زۆریان دا بەم ڕووداوە گەورەو گرنگە. ڕۆژنامەو گۆڤارەکان لە لاپەڕەی یەکەمیاندا ئەم هەواڵەیان بلاوکردەوەو ئەم ڕووداوە جێگای خۆشی و ڕازی بوونی هەموو ڕۆشنبیران و سیاسیان بوو. کەناڵی ئاسمانی میدو بەشی کوردی دەنگی ئەمەریکاو کەناڵی ئاسمانی K.T.V هەواڵەکەیان بلاوکردەوە. هەروەها لەو بارەیەوە لە ئەستەمبوڵ کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسیم بەست کە ڕۆژنامەکانی (ڕۆژنامەی ئازادیا وڵات- ڕۆژنامەی 2000یەنی گوندەم- ڕۆژنامەی پینە- گۆڤاری زەند- ئامادەی بوون) هەروەها هەندێ لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە گفتوگۆیان لەبارەی ئەم ڕووداوەوەو لەبارەی بارو دۆخی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردییەوە لە سوریا لەگەڵ سازدام. دواتریش زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤاری حیزبە کوردستانیەکان ئەم هەواڵەیان بلاوکردەوە، لەوانەش ڕۆژنامەی میدیا، ڕزگاری، ڕێگای کوردستان، ڕۆژنامەی (یەکێتی) حیزبی دیموکراتی سوریا، ڕۆژنامەی ژین کە ڕۆژنامەی پارتی دیموکراتی کوردی سورییایە. ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ڕۆژنامەی نەورۆز. گۆڤاری پێرس و تاد.

لە ڕاستیدا من سەرسام بووم بەو بایەخە گەورەی کە ڕۆژنامەو ڕاگەیاندنی کوردی و بیانی بەم ڕووداوەی دا.

سەرنجێك: بەشێکە لەو گفتوگۆیەی کە یاوکی باران لەگەڵ توێژەری کورد دلاوەر زەنگی سەبارەت بە بەخشینی خەلاتی عوسمان سەبری بە دکتۆر ئیسماعیل بێشکچی سازی داوە.

ئێمە گفتوگۆکەمان بەدەستنووس بەدەست گەیشتووە. بەلام پێشتر لە ڕۆژنامەی (خەبات) دا بلاوکراوەتەوە.

و: ڕۆژڤار



# بۆ ئیسماعیل بێشکچی

شێرکۆ بێکەس

دارێ وتی:

-ئێمە ئێستاکە ناتوانین شەقامێکی "دیاربەکر"

بەناوی تۆوە ناوبنێین.

گوڵێ گوتی:

-ئێمە ئێستاکە ناتوانین باخچەیەکی نێو "قامیشلی"

بەناوی تۆوە ناوبنێین.

شیعرێ وتی:

-ئێمە ئێستاکە ناتوانین کتێبخانەیەکی "سابلاخ"

بەناوی تۆوە ناوبنێین.

بەردێ گوتی:

-ئێمە ئێستاکە ناتوانین پەیکەرێکت

لە سنگی بابەگورگڕدا بۆ داتاشین

دوایی "کوردستان"یش وتی:

-ئەوەی ئێستاکە ئێمە ئەتوانین بیکەین

هەر ئەوەیە

وەک گوڵ و شیعرو ئازادیی

لە گیانماندا هەڵتگرین!

1990

# ئیسماعیل بێشکچی

# زیندانی ویژدان

نووسینی: شار ئیلئیسار
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: ڕۆڤار

حکومەتی تورکی هەمیشە زۆر بە توندی و بە خێرایی هەڵوێستی بەرامبەر بەهەر بەیانکردن یان پتەوکردنێکی داواکاری کورد بۆ مافەکانی نواندووە. حوکمی بەندکردنی دوورو درێژ دراوە بەسەر کەسانێکدا کە هەرگیز بەشداری کاری توندو تیژیان دژی حکومەت نەکردووە بەڵکو هەر بۆیە حوکم دراون چونکە تەنیا بە نووسین یان بە قسە بەرگرییان لە مافەکانی کورد کردووە. ئازاردانی دکتۆر ئیسماعیل بێشکچی بووە بەهۆی وەسفکردنی و هەروەها ئەو ڕەفتارە سەرنجی دنیای بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە چۆن تورکیا پێ لە مافەکانی مرۆڤ دەنێت. بێشکچی کۆمەڵناسێکی تورکەو لە کتێبێکدا ساڵی 1969 کە بەناونیشانی "ڕێکخستنی ئەناتۆلیای ڕۆژهەڵاتی: بنەما کۆمەڵایەتی و ئابوری و ئێتنیکییەکان"ە بێشکچی ڕەخنەی توندی لە تورکیا گرتووە لە پای ئەوەی کە هەرێمەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی پشتگوێ خستووە. هەروەها لەو کتێبەدا ئیسغلال کردنی کۆمەڵایەتی و ئابوری و سەرکوتکردنی سیاسیانەی کوردی لەلایەن دەوڵەتی تورکەوە شیکردۆتەوە. حکومەت هەر بە زوویی بێشکچی بەوە تاوانبار کرد کە "دوژمنی" نەتەوەی تورکەو بە کرێگیراوێکی کۆمۆنیستە پروپاگەندەی کوردایەتی بڵاودەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە هیچ ڕەتکردنەوەو پوچکردنەوەیەکی ئەکادیمیانە یان زانستیانە لەلایەن ئاکادیمی و کۆمەڵناسە شارەزاکانی تورکەوە بۆ دەرئەنجامی توێژینەوەکانی بێشکچی پێشکەش نەکرا، بەڵام هەر بە زوویی بێشکچی لە مامۆستایەتی زانکۆی ئەتاتورك لە ئەرزەڕۆم دەرکرا.

لە ساڵی 1971 بێشکچی خرایە زیندانەوەو دواتر ساڵی 1974 کاتێ ئەجەویدی سەرۆك وەزیر لێبوردنی گشتی بۆ زیندانیە سیاسیەکان دەرکرد ئازادکرا.

دکتۆر بێشکچی سێ لێکۆڵینەوەی تری لەسەر کورد لە تورکیا بڵاوکردەوە پێش ئەوەی جارێکی تر لە ساڵی 1979دا دەستگیر بکرێتەوە لەسەر هەمان تاوانبارکردن کە پێش چەند ساڵێك خرابووە ئەستۆی. بێشکچی بۆ ماوەی سێ ساڵی تر بەند کرا پاشان بەربوو. ئەنجاش دوو مانگی تر خرایەوە زیندانەوە. بێشکچی پێشتر نامەیەکی سوپاسکردنی بۆ ژنە سەرۆکی یەکێتی نووسەرانی سویسرا نووسیبوو. لەبەرئەوە تاوانبارکرابوو بەوەی کە زانیاری بێ بنەماو درۆی دەربارەی مەسەلە ناوخۆییەکانی تورکیا بڵاوکردۆتەوە ئەویش بە مەبەستی کەمکردنەوەو هێنانەخوارەوەی کەسێتی و نفوزی دەوڵەت لە وڵاتێکی بێگانەدا بێشکچی لە مایسی ساڵی 1989دا لە زیندان ئازادکرا بەڵام لە کانوونی یەکەمی ساڵی (1987) برایەوە بۆ بەندیخانە ئەویش لەسەر گفتوگۆیەك کە بۆ "ئۆرگار گێلچیل"ی کردبوو تیایدا بەرگری لە مافە ئێتنیکییەکانی کورد کردبوو. پاش ماوەیەکی کورت ئەمجارەش ئازادکرایەوە بەڵام دیسان لە شوباتی 1990دا جارێکی تر گیرایەوە.

گرتنەکەی ساڵی 1990ی بێشکچی لەسەر نووسینی کتێبێکی تازە بوو بە ناوی "کوردستان: کۆلۆنیەکی نێودەوڵەتی"ە. ئەم کتێبە بریتییە لە شیکردنەوەیەکی مێژووییانەی ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی تورك لە کوردستان لەگەڵ شیکردنەوەی هەمەلایەنەی سیاسەتە تایبەتیەکانی تورك بۆ هێمن کردنەوەی کوردو بۆچی کورد شکستی خواردووە. لە پەیامێکی درێژی دەستپێکداو لەبەردەم دادگاداو بۆ دادگایی کردن لە 18ای نیسانی 1990دا بێشکچی گوتی: دەوڵەتی تورك و ئایدۆلۆژیای ڕەسمی دەوڵەت نکوڵی بوونی نەتەوەی کوردو زمانی کوردی دەکەن. کورد وا دادەنێن کە خێڵێکی تورکیەو زمانی کوردیش دایەلێکتێکی زمانی تورکیە. بەم شێوەیە ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی (دەوڵەت) ڕاستییە کۆمەڵایەتیەکان ڕەتدەکاتەوە. ئایدۆلۆژیای ڕەسمی دان بە هیچ ئایدۆلۆژیایەکی تردا نانێت. ئەوانەی لە دەرەوەی سنووری ئایدۆلۆژیای ڕەسمیدان بەرەو بەندیخانە دەبرێن، سەپاندنی ئایدۆلۆژیای ڕەسمی (دەوڵەت) ڕێگا لە پەرەسەندنی شیکردنەوەی زانستی و پەرەسەندنی زانست، دەگرێت. ئەم فشارە بیروباوەڕ ئیفلیج دەکات و مێشك لاوازو بێهێز دەکات.. من بەشداری ئەو تێڕوانین و بۆچوونانە ناکەم کە بۆ تاوانبارکردنم خرانەڕوو، چونکە ئەو بۆچوونانە دەربڕینی ئایدۆلۆژیای ڕەسمین و لەسەر بنەمای درۆو نکوڵی کردنی ڕاستی بنیاد نراون: دەشێ ئەم شتانە لە یاسادا هەبن بەڵام نارەوان. (ئەو دەستوورە) ئەگەر هی پێنج جەنەراڵ بێت یان هی (450) ئایب ئەوە هیچ جیاوازییەك دروست ناکات. ئەو دەستوورەی کە نکوڵی بوونی نەتەوەی کوردو زمان و کەلتورەکەی دەکات بە هیچ شێوەیەك ناشێت دەستورێکی ڕەوا بێت، لە یاسادا ڕەوابوون زۆر گرنگترە لە چاو دەستوردا

دوای ئەوە ئیسماعیل بێشکچی بەرگری لە پشتگیری خۆی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کورد کرد.

کورد چوار هەزار ساڵە لە کوردستان دەژی لە کاتێکدا کە تورك لە نیوەی دووەمی سەدەی یانزەدا لە ئاسیای ناوەندەوە کەوتە جوڵە بە خۆراساندا بۆ ئێران و کوردستان و عێراق و سوریاو ئەناتۆڵیا.. ژیانی تورکەکان لەسەر ئەم خاکانە هێشتا نەبووە بە هەزار ساڵ ئەم تورکانە سوکایەتی و بێ نرخیان بە خاوەنە ئەسڵییەکانی ئەم خاکانە کردووە.. تورك لە پێناوی لەنێوبردنی نەتەوەی کوردو زمان و کەلتورەکەیدا بەربەریانە ڕەفتار دەکەن. نەتەوەی تورك شایانی ئەوە نیە کە وا بناسرێت ئەنجامدەری ئەو جۆرە بەربەریەتیەیە. من دەمەوێت کەمێ لەسەر چەمکی "سەروەی نەتەوەیی" ڕابووەستم و دەمەوێت گەل کورد ئازادبێت. ویستنی ئەوەی کە کورد لە بارودۆخێکی یەکسان لەگەڵ تورکدا بژین وا وەردەگیرێ کە پروپاگەندەی لاوازکردنی سەروەرێتی تورك بێت. لە ڕاستیدا داواکردنی یەکسانی بۆ گەل کورد یان بەلاوەنانی بڕیاری قەدەغەکردنی لەسەر زمان و کەلتوری کوردی بە ئاشکرا ناتوانێت سەروەرێتی نەتەوەیی تورك لاواز بکات. بە پێچەوانەوە سەروەرێتی نەتەوەیی تورك پتەو دەکات ئەگەر بەرگریکردن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکان هەستی نەتەوەیی بەهێز بکات.

ئیسماعیل بێشکچی ناوبانگی نێو نەتەوەیی پێبەخشراوە، لەو ئاقارەشدا لە لایەن ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی مافی مرۆڤەوە بە "زیندانی ویژدان" ناوبراوەو دیارە بە ئاشکرا ئەو ڕێکخراوە بەرپرسیارە لە پاراستنی ژیانی بێشکچی. هەرچەندە ئەو ناوبانگە نێونەتەوەییە نەبوو بەهۆ بۆ ئەوەی دەسەڵاتدارانی زیندان واز لە ئازاردانی بهێنن. هەروەکو هێلسنکی ۆچ و ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی و دەستکردن بە باسی مافی مرۆڤی لە کوردستاندا (گرووپی پشت بەستوو بە ئەڵمانیا بۆ مافەکانی مرۆڤ) و هەروەها سەرچاوە سەربەخۆ نێونەتەوەییەکانی تری مافی مرۆڤ بە بەڵگەوە بڵاویان کردۆتەوە، کە لە مەڵبەندەکانی دەست بەسەردا گرتن و مەڵبەندەکانی پۆلیسی تورکیادا کوردەکان بە توندی ئازار دەدرێن

هەر تاوانبارکردنێکی تاکەکەس لە یارمەتیدانی گەریلاکان لەناو ئەوانەشدا خزمەتی پزیشکیانەو بەرگری کردنی پارێزەران بابەتی گرتنن بۆ نموونە دکتۆر عەبدوڵڵا بۆلکا کە پزیشك و بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی (سیزرا) بوو لە هەرێمی ماردین لە ئەیلولی ساڵی 1989دا دەستگیر کرا لەسەر ئەوەی کە نەخۆشێکی چارەسەرکردبوو، پۆلیس بڕوای وابوو ئەو نەخۆشە ئەندامی پارتی کرێکارانی کوردستانە. دکتۆر بۆلکا بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ ئازاردرا پێش ئەوەی ئازاد بکرێت، پاشان لە کارەکەی دەرکراو ڕەوانەی (یوزگات) کرا لە ڕۆژئاوای تورکیا. لە سەروەختی ئازادبوونیداو دەرچوونی لە حاڵەتی دەستبەسەری بۆلکا گوتویەتی، من پەیوەندیم بە پارتی کرێکارانەوە نیە، ئەرکی سەرشانی من وەکو پزیشك برێتییە لە پێشکەشکردنی چارەسەری پزیشکی بۆ هەرکەسێ کە پێویستی پێی بێت، من ناتوانم بزانم داخۆ ئەو نەخۆشە تیرۆریستەیان نا. سەرباری ئەوەش من پێویستم بەوە نیە بە دوای ئەوەدا بگەڕێم، ئەوە ئەرکی من نیە.

ئامرازێکی تری سەرکوتکردنی ناسنامەی ئێتنیکی کوردی بریتی بووە لە ئاوارەکردنی خەڵکی بە ڕێژەیەکی بەرز لە گوندەکانی باشووریان. بنەمای یاسایی بۆ ئاوارەکردن لە یاسای ژمارە (2510)دا هاتووە کە دانراوەو لە حوزەیرانی ساڵی 1934دا بڵاوەکراوەتەوە. بەپێی ئەم یاسایە ئەو کەسەی زمانی دایکی تورکی نەبێت دەشێ لەبەر هۆکاری سەربازی یان سیاسی یان کەلتوری یان هۆکاری ئاسایش دیسان جێگیر بکرێتەوە ئەگەر وەزارەتی ناوخۆ وای دانا کە ئەوە بۆ بەرژەوەندی وڵات پێویستە. لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە دەرکردنی گوندنشینە کوردەکان شوێنی خۆیان و نیشتەجێکردنەوەیان لە ڕۆژئاوای تورکیا بە شێوەیەکی ڕێکوپێک جێبەجێ دەکرێت و بێشکچی بە توندی دژی ئەو سیاسەتە ڕاوەستاوە.

سەرچاوە:
Nader Entessar
Kurds Ethinonationalism



# خەباتی بێشکچی و خەباتی کورد

عەتا قەرەداخی

ئەگەر بە وردی سەرنجی تێڕوانینی بێشکچی سەبارەت بە کورد بدەین ئەوا ڕاستەوخۆ بۆمان دەردەکەوێت کە بێشکچی وەکو نەتەوەیەکی یەکگرتوو دەڕوانێتە کوردو پێی وایە ئەم پێکهاتەیە سەرباری دابەشکردن و پارچەپارچەکردنی، سەرباری جیاوازی زارەکانی ناخاوتنی. سەرباری وابەستەبوونی بە کەلتورە جیاوازەکانی داگیرکەرەکانییەوە بەڵام هێشتا بە توندی پارێزگاری لە بوونی نەتەوەیی خۆیی و لە ناسنامەی نەتەوەیی خۆی کردووە، بە جۆرێك کە سەرجەم هەوڵەکانی لەناوبردن و سڕینەوەی شکست پێهێناوەو وەکو پێکهاتەیەکی ئیتنیکی زیندو ماوەتەوەو دەیەوێت بوونی خۆی بسەلمێنێت.

بێشکچی وەکو کەمایەتیەکی ئیتنیکی سەیری کورد ناکات بەڵکو پێی وایە کورد نەتەوەیەکی تەواوەو داگیرکەران لە ڕێگای دابەشکردنیەوە هەوڵیانداوە بیکەن بە چەند کەمایەتیەك، ئەوەتا بێشکچی دەڵێت: کێشەی کورد کێشەی کەمایەتیەکان نییەو ئەم کێشەیەش کە بە کێشەی کورد ناودەبرێت شتێکە پەیوەندی بە مافەکانی کەمایەتیەکانەوە نییە. بەڵکو گەوهەری کێشەی کورد لەو ڕاستیەدا حەشاردەدرێت کە گەلی کوردو وڵاتەکەی کە کوردستانە لەلایەن دەوڵەتانی ئیمپریالیزمەوە پارچەپارچەو دابەشکراوەو مافی گەلی کوردیان لە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیدا پێشێل کردووە [کردستان مستعمرە دولیە. ص 33] لەم قسەیەی بیشکچییەوە دەردەکەوێت کە کورد وەکو نەتەوەیەك ناشێت بە کەمایەتی دابنرێت و بەو پێیەش باسی مافی کەمایەتی بۆ بکرێت، کە مافی کەمایەتی لە مافی کەلتوری و دەسەڵاتی سنووورداری ناوچەییدا ناتوانن کێشەی دێرینەی کورد چارەسەر بکەن. بەڵکو بە پێچەوانەوە کێشەی کورد کێشەی نەتەوەیەکی خاوەن خاك و مێژوو ناماهەبوونی دوورو درێژە لەسەر ئەو خاکەو بەبێ سەربەخۆیی و دروستکردنی دەوڵەت چارەسەر ناکرێت هەڵبەت بێشکچی بەبێ بنەمایەکی پتەو ناگاتە ئەو ئاستەی کە بەو جۆرە پێ لەسەر سەربەخۆیی کورد دابگرێت، بەڵکو ئەم وەکو کۆمەڵناسێك لە ئەنجامی توێژینەوەی باری کۆمەڵایەتی کوردیدا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ڕاشکاوانە نەك هەر ڕای خۆی لەو ڕووەوە بخاتەڕوو بەڵکو شێلگرانە بەرگریش لەو ڕایانەی خۆی بکات، باجی قورسیش بدات ئەویش لە زیندانیکردنی دوورو درێژو دەرکردن لە کارو غەرامە لێسەندندا خۆی بینیوەتەوە. هەموو ئەمانەش دەبنە بەڵگەی زیندو بۆ هەڵوێستی ئەو ڕۆشنبیرەی کە لە پێناوی دانشان بەوانی تردا ئامادەیی سەوداگەری نییەو هەموو قوربانیەکیش دەدات

بێشکچی پێی وایە سەروەرێتی نەتەوەی تورك بەوە ناپارێزرێت کە دەوڵەتی ناسیونالیزمی تورکی بە هەموو شێوەیەك پرۆژەی تواندنەوەو لەنێوبردنی گەلی کورد لەو بەشەی کوردستاندا دابنێت کە لکێنراوە بە دەوڵەتی تورکیاوە، بێشکچی وەکو کۆمەڵناسێك کە میتۆدی مارکسیانەی کردووە بە ڕێگای شیکردنەوەکانی لە کۆمەڵگای کوردیدا ئیلهامی ئەو تێڕوانینەی خۆیی لە تیۆری مارکسیزمەوە وەرگرتووەو لەو گوتەیەوە کە دەڵێت: ئەو گەلەی گەلێکی تر دەوچەوسێنێتەوە خۆیشی ئازاد نییەو بەڵکو ئازادی خۆی دەدۆڕێنێت. بەڵام بە پێچەوانەی ئەم تێڕوانینەی بێشکچییەوە، ناسیونالیزمی تورکیی لەبەرئەوەی ناسیونالیزمی نەتەوەیەکی بێ مێژوو بێ شارستانێت و بێ فەرهەنگ و کەلتوری دەوڵەمەندی ڕابردووەو پایەکانی بوونی بەهێز نییەو بەردەوام خۆی لە بەردەم مەترسی و هەڕەشەدا دەبینێتەوە، ناتوانێت لە دەرەوەی خۆی دان بە ئەوانی تردا بێت و بۆ ئەو مەبەستەش ڕێگای لەنێوبردن و سڕینەوەو پاکتاوکردنی ڕەگەزی لەبەر دەگرێت، لەو بوارەشدا ناسیونالیزمی تورکی هیچ درێغیان نەکردووەو لە هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی عوسمانی و دروستبوونی دەوڵەتی نوێی تورکیا لەسەر دەستی کەمال ئەتاتورکەوە تاکو ئێستا سیاسەتی جینۆسایدی کورد پیادە دەکات بەو هیوایەی ناسنامەی جیاواز لە ناسنامەی تورکی لەو وڵاتەدا بوونی نەمێنێت . تورکیا دەڵێت بەردەوام دەبێت لە پیادەکردنی سیاسەتی سەرکوتانەوە بۆ ئەوەی کەسێك نەمێنێتەوە پڕکێشی بکات وشەیەکی کوردی بدرکێنێ. یان پڕکێشی داواکردنی مافە نەتەوەیی و دیموکراتییەکانی کورد بکات . [کردستان مستعمرە دولیە ص 101–102].

ئەم قسەیەی سەرەوە ئەوە دەسەلمێنێت کە تورکیا نەك هەر دان بە بوونی ناسنامەی کورددا نانێت بەڵکو هەوڵی بە تەواوەتی لەناوبردنیشی دەدات. هەر لێرەوەو لە ئەنجامی ئەم سیاسەتە نامرۆڤانەدا کە ناسیونالیزمی تورك لە بەری گرتووە، کورد لەو بەشەی کوردستاندا پەنای بۆ خەباتی چەکداری بردووە وەکو ڕێگایەك بۆ خۆپاراستن، بێگومان لەو پێناوەشدا خوێنی زۆری بەخشیوە بەڵام دەستکەوتێکی ئەوتۆی بە دەستنەهێناوە. چونکە تاکو ئێستاش کورد لەو بەشەدا نەك هیچ مافێکی دیاریکراوی خۆی بەدەستنەهێناوە بەڵکو بە تەواوەتی لە ڕووی هەست و ئەستی کۆمەڵایەتیەوە نەگەڕاوەتەوە بۆ سنووری یادەوەری ڕابردووی خۆیی و بەلای کەمەوە زمانی نەتەوەیی خۆی زیندوبکاتەوە، ئەو جێگایانەی کە لەو بەشەی کوردستان تیایاندا زمانی کوردی لەبیرنەچۆتەوە تەنیا ئەو لادێ دوورەدەستانەن کە دەوڵەتی تورکی نەیتوانیوە دانیشتوانەکەی لە زمانی دایك پەرت بکات. هەر لەسەر ئەو بنەمایەش ئەو کوردانەی کە ناسیونالیزمی تورك نەیتوانیوە کوردایەتیان وەکو زمان و دابونەریت لێبکاتەوە ناوی ناون تورکی چیایی. زاراوەی چیایی لەو ڕوانگەیەوە کە دەوڵەتی تورك بەکاریهێناوە زاراوەیەکە دەلالەتی دواکەوتوویی و سەرەتاییبوون هەڵدەگرێت، واتە سەرباری ئەوەی کە ناسیونالیزمی تورك هەوڵیداوە ناسنامەی کوردو کوردبوون لە سنووری دەوڵەتەکەیدا لەناوبیبات و تەنیا یەك ناسنامەو یەك گەل لە تورکیادا هەبێت ئەویش ناسنامەی تورکی و گەلی تورك بێت، بەڵام ئەو کوردانەی کە بە تەواوەتی لەنێو پرۆسەی بە تورککردندا نەتواونەتەوە. ناوێکی کەم بەهای بۆ هەڵبژاردوون کە ئەویش تورکی چیاییە، واتە ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیانەی کە

سەرەتایی و دواکەوتوون و دوورن لە شارستانێتی. بێگومان ئەم زاراوەیەش دانیشتوانی باشوری ڕۆژهەلاتی تورکیا هەمووی دەگرێتەوە، واتە بەشی زۆر کوردستانی لکێندراو بە تورکیاوە.

بێشکچی پێی وایە کێشەی کورد لە تورکیادا، کێشەی دواکەوتوویی و سەرەتایی بوون و نەگونجاندن لەگەڵ شارستانێتی ئەم سەردەمەدا نییە وەکو ناسیونالیزمی تورك باسی لێوە دەکات. بەڵکو کێشەی کورد لەم بەشەی کوردستاندا کێشەی نەتەوەیەکە کە بە زۆر وڵاتەکەی داگیرکراوەو دابەشکراوە بەسەر چەند دەوڵەتێکی ناسیونالیزمی ناوچەکەداو لەو بەشەیدا کە بە تورکیاوە لکێنراوە دەوڵەتی تورکی بە هەموو شێوەیەك هەوڵیداوە بە دواکەوتی و نەخوێندەواری بیهێڵێتەوەو لە هەموو دیاردەیەکی شارستانی و لە هەموو پێشکەوتنێك بێبەشی بکات. واتە دواکەوتنی ئەو بەشەی کوردستان کە بە تورکیاوە لکێنراوەو بەشەکانی تری کوردستانیش تێکڕا بە هۆی سیاسەتی نالەباری دگیرکەرانی کوردستانەوە. ئەویش لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان نایانەوێت پێشکەوتن لە خوێندەواری و پیشەسازی و ڕێگاوبان و سیماکانی تری کۆمەڵگای هاوچەرخ بگاتە کوردستان چونکە دەزانن لە ملومەرجێکی لەو جۆرەدا کۆمەڵگای کوردی بەرەو پێشەوە دەچێت و هەست و هوشیاری نەتەوەیی کوردیش لە ئاکامی ئەوەدا بەرەو پەرەسەندن و بەهێزبوون دەچێت و بەوەش بنەمای پرۆژەی ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی داگیرکەران لە کوردستاندا دادەنرێت، دووەمیان ئەوەیە کە داگیرکەرانی کوردستان سەرباری هەموو هەوڵێکیان بۆ لەنێوبردنی کورد، لەوە دڵنیان کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ناسیونالیزمی کوردی دەگاتە ئەو ئاستەی پێگەیشتن کە دەسەڵاتی داگیرکەران لەسەر خاکەکەی ڕەتدەکاتەوەو سەربەخۆیی خۆی بەدەست دێنێت و ئەوی داگیرکەر بە ناچاری دەبێ کوردستان بەجێبهێڵێت واتە ناسیونالیزمی دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان لەوە دڵنیان کە ناتوانن بۆ هەتاهەتایە کوردستان داگیربکەن و لەژێر سایەی دەسەڵاتی خۆیاندا بیهێڵنەوە. بە قسەیەکی تر داگیرکەرانی کوردستان دڵیان بەوە خۆش نیە کە کوردستان هەتاهەتایە کوردستانی ئەوان بێت و وەکو بێشکچی دەڵێت کوردیش بێبەش لە کوردستان. واتە دەتوانین بڵێین تەوحی داگیرکەرانی عەرەب و تورك و فارس لە کوردستاندا تەوحی ئابوریانەو سیاسیانەو ستراتیژانەیە کە ناشێت هەتا سەر ئەو تەوحەیان بۆ جێبەجێ بکرێت.

لێرەوە بێشکچی سەرنجمان بۆ لایەنێکی تر لە توێژینەوەکانی خۆی سەبارەت بە نەتەوەی کورد ڕادەکێشێت، ئەویش ڕوانینە بۆ هەموو کوردستان وەکو یەك وڵات و هەموو بەشەکانی وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو بەڵام بە زۆر پارچەپارچەو دابەشکراو لەنێو کۆمەڵێ داگیرکەردا سەیردەکات و لەو ڕوانگەیەشەوە کوردستان وەکو کۆلۆنیەکی ئاسایی سەیر ناکات بەڵکو بە شێوەیەکی هێجگار تایبەتی سەیریدەکات. ئەویش لەو ڕوانگەیەوە کوردستان لە کۆلۆنیەکانی تری جیهان ناچێت، بۆ نموونە دەڵێت: لە ڕۆژهەلاتی نزیکدا جیاوازییەکی زۆر گەورە لە نێوان حاڵەتی فەلەستین و حاڵەتی کوردستاندا هەیە. کوردەکان بە دەوڵەتانی دژ دەورە دراون– ل26) واتە ئەو دەوڵەتانەی کە دەوری کوردستانیان داوەو کوردستانیان لە نێواندا دابەشکراوەو داگیریان کردووەو داگیرکەرن بەسەر کوردستانەوە واتە لەو ڕوانگەیەوە دوژمنی کوردن، بێگومان ئەو دەوڵەتانەش خۆیان دوژمنایەتی کوردیان هەڵبژاردووەو کوردیان خستۆتە هەلوێستی دوژمنایەتی خۆیانەوەو لە پێناوی بەرژەوەندییە ئابوری و سیاسی و ستراتیژیکانیاندا ئامادە نین واز لەو دوژمنایەتییەی خۆیان بۆ کورد بهێنن و دەیانەوێت بۆ هەتاهەتایە کوردستان لە بندەستی خۆیاندا بهێڵنەوە. لێرەدا دەردەکەوێت کە داگیرکەرانی کوردستان بە ناسنامە جیاوازەکانیانەوە یەك گەوهەرو یەك ستراتیژیان هەیە، هەمووشیان پێکەوە تاکە وڵاتێکیان داگیرکردووە، بەڵام لەگەڵ پرۆسەی داگیرکردندا پرۆسەی دابەشکردنیشیان ئەنجامداوەو بەوکارەش یەکێتی نەتەوەیی کوردیان دابەشکردووەو جەستەی کوردیان کردۆتە چەند بەشێك بەو کارەش هێزو توانای ئەو جەستەیان بۆ بەرگری و لە ڕوودا وەستان بۆ ڕابوونەوەو شۆڕشکردن لاواز کردووە.

کاتێ عەرەبەکانی فەلەستین خەبات دەکەن و ئاڕاستەی خەباتەکەیان یەك ئاڕاستەیەو بەرەو یەك هێز دەکرێتەوە کە وڵاتەکەیانی داگیرکردووە، بەڵام بە گوێرەی کورد لەبەرئەوەی داگیرکەرانی وڵاتەکەی جۆراوجۆرن بەو پێیەش خەباتی کورد دابەشدەبێت چ لە بەرنامەو چ لە ئاڕاستەکردندا. بێگومان دابەشکردنی کوردستان لە نێوان داگیرکەراندا خەباتی کوردیشی دابەشکردووە. زۆربەی کات بارێکی ناهەمواریشی دروستکردووە بۆ بزوتنەوە نەتەوەییەکانی هەر بەشێکی کوردستان بۆ دۆستایەتی و هاریکاری و هاوپەیمانی کردن لەگەڵ دەوڵەتی داگیرکەری سەر بەشەکانی تردا، بۆ نموونە ئەو بزوتنەوانەی لە کوردستانی لکێنراو بە عێراقەوە سەریانهەڵداوە، زۆربەی کات پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ دەوڵەتی ئێرانیدا هەبووە ئەویش بەهۆی ناکۆکی نێوان دەوڵەتی ئێران و عێراقەوە، یان بزوتنەوەی کورد لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی ئێراندا زۆرجار پشتی بە دەوڵەتی عێراق بەستووەو بزوتنەوەی نوێی کوردیش لە کوردستانی لێکندراو بە تورکیاوە هەوڵیانداوە پشتگیری مادی و مەعنەوی سوریاو ئێران و تەنانەت عێراقیش بەدەستبهێنن، کە ئەوەش زۆربەی کات بۆتە هۆی ناکۆکی لە نێوان بزوتنەوەکانی کورد خۆیاندا.

ئەم دیاردەیە ڕەنگە لە ڕوکەشدا گرنگ یان مەترسیدار نەیەتە پێشچاو.



بەلام لە گەوهەردا دەوری کاریگەری بینیوە لە زیاتر هەلوەشاندنەوەی یەکێتی نەتەوەی کورداو هەر ئەگەرێکی دروستبوونی ستراتیژی نەتەوەیی کوردی دوورخستۆتەوە.

گەوهەری لێکدانەوەکانی بێشکچی بۆ ڕزگارکردنی کوردستان و بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و دروستبوونی دەولەتی سەربەخۆی کوردستان بە بێ بوونی یەکێتی و یەکبوون لە نێوان بەشەکانی کورددا کارێکی نەشیاوە، مەبەست لەو یەکێتی و یەکبوونەش پرۆژەی دروستبوونی ستراتیژی نەتەوەیی کوردە، ڕاستە دوژمنەکانی کورد یان داگیرکەرەکانی کوردستان جۆراوجۆرن و بەوپێیەش بزوتنەوە نەتەوەییەکانی کوردیش جۆراوجۆرو ئێد دەبن، ئەو جۆراوجۆرێتییەش مانای کوشتنی هێزی سەرەکی یەکبوونی نەتەوەییە. بە واتا ئەمەش پرۆسەیەکە دژ بە ستراتیژی نەتەوەیی کورد. کەواتە بێشکچی چۆن لە ستراتیژی نەتەوەیی کورد دەڕوانێت؟ ڕوانینی بێشکچی بۆ ئەم چەمکە ڕووی زانستی لێکدانەوەکانی گەشتر دەکات و زیاتر دەیکاتە کۆمەلناسێکی خاوەن کەسێتی دیار. بێشکچی پێی وایە مەسەلەی ستراتیژی نەتەوەیی کورد بەندە بە ئاستی هوشیاری نەتەوەیی کوردەوەو چەندێ هوشیاری نەتەوەیی پەرەبسەنێت و بەرەو پێشەوە بچێت لەگەلیدا زەمینەی پێکهاتنی ستراتیژی نەتەوەیی زیاتر دەڕەخسێت، لەو میانەشدا زەمینەی یەکێتی کورد بەرەو فەراهەم بوون دەچێت چونکە لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە ستراتیژی نەتەوەیی بەرهەمی ئەو ساتەوەختەیە لە ژیانی هەر کۆمەلگایەکدا کە کۆمەلایەتی بوون بووبێتە حالەتێکی بالادەست و کۆمەلگا سیمای یەکمیەکی یەکگرتووی وەرگرتبێت و قۆناغەکانی ژیانی پارچەپارچەیی خێلایەتی و هەرێمگیری و ناوچەگەرێتی بەجێهێشتبێت و وابەستەبوون و پەیوەستبوون بۆ نەتەوە بەسەر وابەستەبوون و پەیوەستبوون بۆ خێل و عەشیرەت زالبووبێت و وەلاء بۆ هەرێم و ناوچەیەکی دیاریکراو کۆتایی هاتبێت و وەلاء بۆ کوردستان وەکو نیشتمانی هەموو کورد جێگای گرتبێتەوە.

بەلای بێشکچییەوە گەیشتنی کورد بە ئاستی مامەلەکردن وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو لەسەر ئاستی کوردستان بەندە بە ئاستی گەشەکردنی هوشیاری نەتەوەیی کوردەوە.. هەتا ئاستی هوشیاری بەرزتر بێتەوە یەکێتی نەتەوەیی پتەوتر دەبێت و لەو ئاقارەشدا کورد لە ئامانجەکانی خۆی نزیکتر دەبێتەوە. بێشکچی پێی وایە کورد لەگەل پرۆسەی دابەشکردنی نیشتمانەکەیدا بەسەر دەولەتانی کۆلۆنیالیستی دواکەوتووی دەوروبەردا.. ئەگەرچی هوشیاری نەتەوایەتیش وەکو پێویست پێنەگەیشتبێت، بەلام خەباتی نەتەوەیی خۆی کردووە بە دژی پرۆژەی دابەشکردنی نیشتمانەکەی و هەولیداوە لە بەرامبەر پرۆژەی داگیرکەراندا بۆ تواندنەوەو لەناوبردنی ئەمیش دژە پرۆژەی خۆیی هەبێت و ڕێگا لە ئامانجەکانی داگیرکەران بگرێت. ئەو دژە پرۆژەیەش لە سەرجەمی ئەو ڕاپەڕینە چەکدارییانەدا خۆی دەبینێتەوە کە لە دابەشکردنی دووەمی کوردستانەوە سەریانهەلداوەو تاکو ئێستاش بەردەوامن. یان لەو هەولە ڕۆشنبیری و کەلتورییانەی کە کورد داوییەتی هەر لە دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤارەوە هەتا چاپکردنی کتێب و بلاوکردنەوەو نووسینەوەی مێژوو و هەولدان بۆ ئەوەی کورد بە زمانی دایکی خۆی بخوێنێت.. سەرجەم ئەمانە دەرئەنجامی سە رهەلدانی جۆرێك لە هوشیاری نەتەوەیی کوردین و بێگومان هەر ئەو هوشیارییەش دەبێتە هێزی جولێنەرو ئاڕاستەکەری هەموو چین و توێژەکانی کورد بەرەو یەك ئامانج کە ئەویش ئامانجی نەتەوەییەو ستراتیژی نەتەوەیش لە پرۆسەی یەکگرتن و یەکبوونی کورد پێکدێت کە ئامانجی ئەوپەڕینی کورد ڕۆحی پێکهێنەری ئەو ستراتیژەیە.

بێشکچی وای دەبینێت گەل کورد سەرباری دابەشکردن و پارچەپارچەکردنی ولاتەکەی، سەرباری هەموو هەول و کۆششێکی داگیرکەرانی ولاتەکەی بۆ هێشتنەوەی لە بارێکدا کە ڕێگای پەرەسەندنی هوشیاری نەتەوە لێبگرن، بەلام هێشتا جۆرێك لە هوشیاری نەتەوەیی لای کورد دروستبووەو ئەو هوشیارییەش بۆتە هۆی سەرهەلدانی ڕاپەڕینەکانی کوردو بە تایبەتیش لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا لەگەل زیاتر پەرەسەندنی ناسیونالیزمی کورددا ڕاپەڕینەکانی کورد زیات سیمای نەتەوەییان وەرگرتووەو لە بری ڕاپەڕینی ناوچەیی سنووردار وەکو بزوتنەوەی نەتەوایەتی نەتەوەییەکی بندەست دەرکەوتوون و خۆیان ناساندووە بێشکچی دەلێت: زۆر شت لە سەردەمی ئەمڕۆماندا گۆڕاوە، کوردستان پرۆسەیەکی گۆڕانکاری بە پەلە بە خۆیەوە دەبینێ، هەروەك بەرفراوانیەکی کاری سیاسیش بەخۆیەوە دەبینێ. کوردەکان بە تایبەتی لە سالانی هەشتاکانەوە دەستیان کردووە بە خستنەڕووی پرسیاری دیاریکراو کە پەیوەندی بە ناسنامەی نەتەوەیی و مێژوویانەوە هەیە. کوردەکان دەپرسن بۆچی تورکیا دەستی بەسەر بەشێکی کوردستاندا گرتووە؟ بۆچی ئێران و عێراق و سوریا دەستیان گرتووە بەسەر بەشەکانی تری کوردستاندا؟

بەلای بێشکچییەوە سەرهەلدانی ئەم پرسیارانە بەلگەی پەرەسەندنی هوشیاری نەتەوەیی کوردە. چونکە کاتێ نەتەوەیەك بگاتە ئەو ئاستەی لە خۆی بپرسێت من چیم؟ کامە ناسنامەکەمە، بۆچی تاکو ئێستا بە دابەشکراویی و داگیرکراوی ماومەتەوە؟ بۆچی هەریەکە لەو ولاتانە بەشێك لە ولاتەکەی منیان دگیرکردووەو هەریەکە لەو داگیرکەرانە خاوەنی کوردستانی خۆیانن و تەنیا کورد خاوەنی کوردستانی خۆی نییە.. ئایا ئەم بارەی کوردستان تاکو کەی بەردەوام دەبێت؟ یان کەی و چۆن و بە چ شێوەیەك هەریەکە لەم بەشانەی کوردستان ڕزگاریان دەبێت؟ ئەی داخۆ شیانی یەکگرتنەوەی ئەم بەشانە هەیە یان نا؟ بێگومان ئەگەر کورد بگاتە ئاستی بەرزکردنەوەی ئەم پرسیارانە مانای وایە هوشیاری نەتەوەیی کوردی پەی بە باری شکستی کورد بردووەو لەو ئاقارەشدا دەشێ گەڕان بە دوای ڕێگای ڕزگاری و سەربەخۆییدا بێت. بێگومان کارێکی لەو جۆرەش هەرگیز ناشێت لە دەرەوەی یەکێتی و یەکبوونی سەرجەم بەش و پارچەو چین و توێژو دەستەو گروپو ئایین و مەزهەبەکانی کورد بگاتە ئەنجام. کورد زۆر ڕێگای خەباتی چەکداری لە سەدەی بیستدا تاقیکردۆتەوە، کە هەریەکەیان ڕاپەڕینی ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستان بوون جگە لە بزوتنەوەی کوردی باشوری کوردستان لە نێوان سالی 1961 بۆ 1975 لە ژێر سەرکردایەتی مەلا مستەفای بەرزانیدا کە بزوتنەوەی هەموو کوردی باشوور بووە جگە لەوا بزوتنەوە ناوچەییەکانی تر نەیانتوانیوە سیمایەکی نەتەوەیی وەربگرن و سنووری ناوچەیی بەجێبهێلن. بزوتنەوە ناوچییەکان نەیانتوانیوە فورسییەکی ئەوتۆ لەسەر دەولەتە داگیرکەرەکانی کوردستان دابنێن. بۆیە ئەو ڕێگایانەی کە کورد لە خەباتی خۆیدا تاقیکردونەتەوە لەبەر ئەوە خەباتێکی یەکگرتووی هەموو نەتەوە نەبوون و لە هەمان کاتیشدا خاوەنی بەرنامەی دیاریی شایان بە مەسەلەی نەتەوەیەکی داگیرکراوو دابەشکراو نەبوون نەگەیشتوونەتە ئاستی بەدەستهێنانی داواکانی کورد. بێگومان کورد لە ترسی سیاسەتی سەرکوتکەرانەی داگیرکەرانی کوردستان و سیاسەتی نامرۆڤانەی دەولەتانی بڕیار بەدەست بەردەوام ویستە ڕەواکانی خۆیی حەشاردراوەو لە بری بەرزکردنەوەی دروشمی سەربەخۆیی و دروستکردنی دەولەت و یەکگرتنەوە. دروشمی زۆر تەسکی وەکو لامەرکەزی و ئۆتۆنۆمی بەرزکردۆتەوە. بەلام لەگەل ئەوەشدا داگیرکەرانی کوردستان ئەو مافە کەمەشیان پێ ڕەوا نەبینیوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کە کورد بەهەر شێوەیەك سەیری داگیرکەرانی ولاتەکەی بکات و بەبراو هاوخەباتیان بزانێت ئە وە ئەوان بە پێچەوانەوە کورد بە دوژمنی خۆیان دەزانن و لە گەوهەریشدا بەرنامەی پاکتاوکردنی ڕەگەزی گەل کوردیان هەیە. بە درێژایی مێژووی دەولەتی نوێی تورکیا، تورکەکان

دریژەیان بە گواستنەوەو بە تورککردنی کورد داوە. لە عێراقدا سیاسەتی پاکتاوکردنی ڕەگەزی ئەگەر لە سەردەمی پاشایەتیشدا زۆر بە ئاشکرا نەبووبێت ئەوا لە سەردەمی کۆمارییەوە تاکو ئێستا بەردەوامەو ناسیونالیزمی عەرەب لە عێراقدا دەیەوێت ناسنامەی کوردبوونی بەشێکی گەورەو پڕ لە بایەخی کوردستان بسڕێتەوە کە ئەویش کەرکوك و شەنگارو خانەقین و مەندەلی و مەخمور و شێخان.. تاد، دەگرێتەوە، بێگومان لە ئێرانیشدا هەمان پرۆسە بەردەوام بوە، بەلام لە ئێران بە تایبەتی لە دوای شۆڕشی ئیسلامییەوە جیاوازی مەزهەبی جێگای جیاوازی ئیتنیکی دەگرێتەوە، بۆیە پاکتاوکردنی مەزهەبی و ئیتنیکی لەو بەشەی کوردستان تێکەلاو بوون. بێشکچی پێی وایە داگیرکەرانی کوردستان هەر جۆرە سیاسەتێك لەبەربگرن و بەهەر جۆرێك هەولی لەنێوبردنی ناسنامەی کوردی بوون بدەن. ئەوە دەبێ ئەو ڕاستییە بزانن کە ناتوانن بۆ هەتاهەتایی بەربەست لە ڕێگای کورددا بۆ سەربەخۆیی‌و دروستکردنی دەولەت و یەکگرتنەوەی کوردستان دابنێن چونکە ئێستا هەم ناسیونالیزمی کوردی بەرەو پێگەیشتن دەچێت، هەم بارودۆخی سیاسی جیهان ڕوو لە گۆڕانە. هەم ئەو سیستەمە تۆتالیتاریانەی لە شێوەی داگیرکەرانی کوردستان ناتوانن بەردەوامی بدەن بە مانەوەی خۆیان ئەگەر هەولی گۆڕانکاری بنەڕەتی لە سیاسەت و عەقل و ستراتیژی خۆیاندا نەدەن چونکە لە جیهانی داهاتوودا کە جیهانی بە گوندبوونی هەموو دنیایە واپێدەچێت لە ئاستی یەکەمدا ئەو سیستەمە سیاسیە دزێوو تۆتالیتارو تەنانەت تیرۆریستانە جێگایان نابێتەوە؛ چونکە بێگومان داهاتووی کۆمەلگای مۆڤایەتی دەبێ دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ تیایدا بالادەست بن. هەلبەت لە بارێکی وەهاشدا کورد سوودمەند دەبێت چونکە ئەوەی لە ڕابردووەوە تاکو ئێسا کورد بە دەستیەوە دەنالێنێ نەبوونی دیموکراسی و ئازادی و مافی مرۆڤە لە سنووری ئەو دەولەتانەدا کە بوونەتە کۆلۆنی بەسەر کوردستانەوە بێگومان ئەگەر دیموکراتی هەبوایە ئەوا کورد دەبووە خاوەنی مافە ڕەواکانی خۆی، بێشکچی پێی وایە یەکێك لە دوو ڕووییەکانی سیاسەتی ڕۆژئاوا ئەوەیە لە ولاتێکی دیکتاتۆری وەکو تورکیادا کە سێ چارەکە سەدەیە پاکتاوی ڕەگەزی کورد دەکات، هێشتا ڕۆژئاوا وەکو ولاتێکی دیموکراتی سەیری تورکیا دەکات. بێگومان لە پشتی ئەو هەلوێستەی ڕۆژئاواوە بەرژەوەندی تایبەتی هەیە، هەر بەوپێیەش بەرژەوەندی دەکەوێتە پێش بەها ئەخلاقیەکانەوە

کوردەکان ئەگەرچی خۆیشیان باسی لێوە ئەکەن و وەکو دروشمیش بەرزی ئەکەنەوە بەلام یەکەمین نەتەوەی سەر زەوین کە دەولەتیان نیەو بەهێزترین تەوحی دروستکردنی دەولەت و بەهێزترین بنەمای مادی دروستکردنی دەولەتیان هەیە.. ئەمە قسەی نادر ئینتیسارە کاتێك باسی پەیوەندی ئیسماعیل بێشکچی بە کوردەوە ئەکات و هەر لەو میانەشدا بێشکچی بە "زیندانی ویژدان" ناودەبات. بێشکچی لەسەر ڕاوبۆچوونە زانستییەکانی سەبارەت بە کورد سەوداگەری ناکات و هەموو قوربانیەك دەدات بەلام ئایا کورد خۆی بەو جۆرەی بێشکچی هەمیشە سوور بووە لەسەر داواکارییەکانی؟ ئایا کاتێك بێشکچی بە ڕووی دادوەرەکانی تورکیادا دەتەقێتەوە دەلێت بەلێ کورد نەتەوەیەکی جیاوازن لە تورك و مێژووی بوونیان لەسەر خاکی خۆیان کە کوردستانە سێ هەزار سال پێش مێژووی تورکە لەم ناوچەیەداو بەوپێیەش مافی خۆیانە لە پێش تورکەوە دەولەتی خۆیان هەبێت.. داخۆ کورد بە فیعلی بەمجۆرە سوور بووە لەسەر داواکارییە نەتەوەییەکانی؟

بێگومان هەلوێستی کورد لەم ڕوانگەیەوە پەیوەندی بە ئاستی پەرەسەندنی هوشیاری نەتەوەیی کوردەوە هەیە، وەکو دەیزانین هەست و هوشیاری نەتەوەیی کورد لە ڕووی پەرەسەندنەوە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە هەم سیمای یەکێتی و یەکبوون لە کوردستاندا ببێتە سیمای کۆمەلایەتی و کۆمەلگای کوردی وەکو یەکەیەکی یەکگرتوو دەربکەوێت کە ئەوەیش دەبێتە دەستەبەرکەری هێزێکی مادی و مەعنەوی ئەوتۆ کە بە هۆیەوە کورد دەتوانێت پێ لەسەر داواکارییەکانی دابگرێت. هەم هوشیاری نەتەوەیی تاکو ئێستا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە هێزی بزوێنەری بزوتنەوەی کوردایەتی بێت و بەوپێیەش هوشیاری نەتەوایەتی بەرنامەی بزوتنەوەی کوردی دانابێت، بەرنامەیەك کە لە ئاستی داواکانی نەتەوەیەکی داگیرکراوو دابەشکراوی وەکو کورددا بێت. بێگومان بەرنامەیەکی لەم جۆرە تاکو ئێستا لە کوردستاندا لە ئاستی دیاردا بوونی نییەو کاریشی بۆ ناکرێت، بەلکو سەرجەم بزوتنەوەکانی کورد لە نیوەی دووەمی سەدەی ڕابردووەوە وەکو بەشێك لە خەباتی ئەو ولاتانە کاریان کردووە کە بەشێك بوون لێی، خەبات لە پێناوی دیموکراتی دەولەتی گەلی سەردەستدا، بێگومان ئەمەش جگە لە وەهم هیچی تر نییە چونکە هەرگیز کورد لە هیچ بەشێکی کوردستاندا ناتوانێت قورسیەکی ئەوتۆی هەبێت لەسەر ناسیونالیزمی نەتەوەی سەردەست هەتا دیموکراتیەت و فرە دەنگی و فرە ناسنامەیی پەسەند بکات. ئەم لێکدانەوەیەش وامان لێدەکات بلێین لە ڕووی بەرنامەو ستراتیژەوە ئێمەی کورد نەمانتوانیوە وەکو بێشکچی پێ لەسەر داواکانی خۆمان دابگرین، ئەگەرچی لەو پێناوەدا قوربانی زۆر دراوە.

ئێمەی کورد زۆربەی کات بەو قسە بێ گەوهەرانەی کە داگیرکەرانی کوردستان بۆ بێدەنگ کردنی کورد بەرزیان کردوەتەوە بەناوی برایەتی‌یەوە دلخۆش بووین و فریومان خواردووەو پێمانوابووە داگیرکەران بەو قسە شیرینانەیان دان بە بوونی نەتەوەیی کورددا دەنێن، لەوە تێنەگەیشتووین ئەوە بە مەبەستی لەباربردنی ڕۆحی ڕابوونەوەو سەربەستیخوازیی کوردییە. بێشکچی دەلێت لە تورکیا دروشمی برایەتی تورك و کورد بەرزدەکرێتەوەو ئەو دروشمەش دەلێت تورك و کورد بران، هەریەکە لایەنێکێن لە یەکێتییەك کە شایەنی جیابوونەوە نیە کردستان مستعمرە دولیە- ص(6). بێگومان ئەم دروشمە لە لایەن عەرەب و فارسیشەوە بە شێوەیەکی بەربلاوتر بەرزکراوەتەوەو جار لە دوای جاریش دەگوترێتەوە، دەشێ ئێمەی کورد کەوتبینە ژێر کاریگەری ئەو دروشمانەوەو نەك هەر بڕوامان پێکردبێ بەلکو زیاتر بانگەشەیشمان بۆ کردبێ، بەلام بێشکچی بەو شێوە سادەیەی ئێمە سەیری ئامانجی دەولەتانی داگیرکەر لە بەرزکردنەوەی ئەو دروشمانەدا ناکات بەلکو پێی وایە دەولەتی تورکی پشتگیری ئەم دروشم و قسانە ناکات بە شێوەیەکی ڕەسمی بەلکو بوار دەدات بە سیاسیە لایەنگرەکان و ڕۆژنامەکان بە پێی پێویست دووبارەی بکەنەوە. کردستان مستعمرە دولە- ص 61.
ئەمەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە کورد تاکو ئێستا لە ڕووی هوشیاری نەتەوەییەوە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە ناسنامەی ناسیونالیزمی پێگەیشتووی هەبێت، هەر ئەوەش وایکردووە بزوتنەوەکانی پەرتوبلاوو ناوچەیی بن و لە ئاکامی ئەوەشدا نەتوانن مافە ڕەواکانی کورد کە خۆی لە سەربەخۆیی و دەولەتدا دەبینێتەوە داوابکەن، بێگومان دروستبوونی ئەم حالەتەش دەرئەنجامی پرۆسەی دوورو درێژی دابەشکردن و داگیرکردنی کوردستانە کە داگیرکردنی سیاسی و ئیداری بۆتە هۆی داگیرکردنی پانتایی هەست و هوشیاریش بە واتایەکی تر کورد لە ئەنجامی پرۆسەی دوورو درێژو یەك بە دوای یەکی کۆلۆنیالیکردنیدا بە تەواوەتی لە ڕابردووی خۆی جیاکراوەتەوەو بەرەو ئامۆیی و ونبوون چووە (ستراتیژ کەسێتی نەتەوەیی کورد- ل 98).

ئەو ونبوونەش گەیاندوویەتیە ئەو ئاستەی کە نەتوانێت داوا ڕەواکانی خۆی بکاتە گەوهەری بەرنامەکەی و لەسەر ئەو بنەمایەش خەباتی



یەکگرتووی نەتەوە وەکو پرۆژەیەکی یەکگرتووی تاکە جەستەیەک دەستپێبکات.

لە کاتێکدا کە داگیرکەرانی کوردستان لە کاتی پێویستیدا دروشمی برایەتی کوردو نەتەوەکانی خۆیان بەرزدەکەنەوە. ئەوەتا تورکەکان سەرباری بەرزکردنەوەی دروشمی برایەتی تورك و کورد کەچی بە ئاشکرا دەڵێن: "کورد مانای گورگ دەگەیەنێت، کورد مانای ئەو بەفرەی لەسەر چیا دەتوێتەوە، وشەی کورد لەو دەنگەوە هاتووە کە ئێستر لەکاتی جۆ خواردندا لێی دەردەچێت، وشەی کورد مانای کێوی، وەحشی، کوردی پیس، کوردی کلکدار یاخود کوردی دووپشك، کوردی بێقیمەت. " تێزی تورك بۆ مێژوو- ل 94) ئەمە گەوهەری ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی تورکە، بێگومان ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی داگیرکەرانی تری کوردستانیش ئەگەر لە ڕووکەشیشدا جیاوازییەکی لە ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی تورکی هەبێت ئەوە گومانی تێدانییە لە گەوهەرو ماهیەتدا هاوشێوەن و هەموویان پرۆژەی سڕینەوەی ناسنامە جیاوازەکانیان هەیە، ڕەنگە دەسەڵاتی تورکی باشتر توانیبێتی ئەو پرۆژەیەی خۆی جێبەجێ بکات لەچاو دەسەڵاتی داگیرکەرانی تری کوردستاندا.

بە ئاشکرا دەبینین ئەو ڕوانینەی ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی تورك هاوشێوەی ڕوانینی هەندێك لە مێژوونووسانی عەرەب و ئیسلامە بەرامبەر بە کورد.

ئەلمەسعودی دەیگوت کورد نەوەی جنۆکەن. مروج الذهب هەروەها ئیبن خەلدون دەیگوت لە نەتەوە بەربەرییەکانی وەکو کورد. مقدمة ابن خلدون. ئیمام خومەینیش لە چاوپێکەوتنێکی شێخ عیزەدینی حسەینیدا بە شێخ عیزەدینی گوت: [لە ئێراندا کێشەی مەزهەبی هەیەو گرفتی کورد جیاوازی مەزهەبیانە لەگەڵ مەزهەبی ئێمەدا..] نادر ئینتیسار: ئیتنۆنەتەوایەتی کوردی- کورد. بێگومان ڕای ناسیونالیزمی فارسی هەمیشە هێمنتر بووە بەرامبەر بە کورد لە چاو عەرەب و تورکدا. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ هاوڕەگەزی کوردو فارس یان هاو ئێرانی بوونیان.

بە هەرحاڵ تێڕوانینی ڕەسمی و ئایدیۆلۆژیای ڕەسمی داگیرکەرانی کوردستان کە بەرهەمی عەقڵی ناسیونالیزمی عەرەب و تورك و فارسە، ئایدیۆلۆژیایەکە، ناتوانێت دان بە بوونی هیچ ناسنامەیەکی تردا بنێت غەیری ناسنامەی ڕەسمی دەوڵەت کە ئەویش ناسنامەی نەتەوەی سەردەستە. ئەوەی کە ئیسماعیل بێشکچی لە تورکیادا ئازاری بە دەستەوە چەشتووەو قوربانی لە پێناویدا داوە. نەتوانینی بێدەنگ بوونیەتی بەرامبەر بەو هەڵوێستە شۆڤێنییەی ناسیونالیزمی تورکی. بێگومان ئەو هەڵوێستەی بێشکچی لە تێگەیشتنی قوڵ و مرۆڤانەیەوە هاتووە بەرامبەر بە ئازادی و ماف کە گەلی کورد لە کوردستاندا کۆیلەی نەبوونی ئازادی و دیموکراتی و مافەکانی مرۆڤە لە مێژووی دوورو درێژیدا. بێگومان ئەو هەڵوێستەی کە بێشکچی وەریگرتووەو لە پێناویشیدا ئازاری زۆر چەشتووە کە بریتییە لە خەباتکردن بۆ داننان بە ناسنامەی ئەویتریدا کە ئێستا لەسەر ئاستی فیکری و سیاسی و فەرهەنگی لە جیهاندا بۆتە مایەی گفتوگۆ لەسەرکردن و داننان بەویتردا خەریکە وەك پێوانەیەکی لێدێت بۆ ئاخاوتن لەسەر ئازادی و دیموکراسی کە ئومێدی ئەوە دەکەین نەتەوە سەردەستەکانی کوردستانیش بگەنە ئەو ئاستەی پێشکەوتن کە چەمکە نوێیەکانی ئازادی و دیموکراتی و مافی مرۆڤ ببێتە بەشێك لە بەرنامەی ئیشکردنی عەقڵی ئەوانیش بە جۆرێك بگەنە ئەو ئاستەی لە ڕێگای پێداچوونەوەی هەڵوێستی نامرۆڤانەی ڕابردوویانەوە ڕەخنە لە ڕابردووی خۆیان بگرن و دان بە بوون و ناسنامەی جیاوازی کورددا بنێن وەکو نەتەوەیەك کە ئەوان مێژوویەکی دوورودرێژە دەیچەوسێننەوەو هەوڵی لەناوبردنی دەدەن.

بێگومان خەباتی دوورو درێژی بێشکچی لە تورکیا لە پێناوی ئەوەدا بووە کە ناسیونالیزمی تورکی دان بە ناسنامەی کوردیدا بنێت و مافی بڕیاردانی چارەنووسی کورد نکوڵی لێنەکرێت. ئەوەش بەسە بۆ ئەوەی کە بێشکچی بە دڵسۆزترین دۆستی کورد دابنرێت. دۆستێك کە هەڵوێستی خۆی لەسەر بنامەیەکی زانستیو مرۆیی بنیادناوە.

**لەو سەرچاوانەی سودیان لێوەرگیراوە:**

1-اسماعیل بێشکچی- کردستان مستعمره دولیه ترجمه: زهیر عبدالملك دار APEC-1998.

2-اسماعیل بێشکچی النظام في الاناضول الشرقیة، ترجمة: شكور مصطفى الجزء الاول و الثاني- دار آراس للطباعة و النشر- 2000.

2-ئیسماعیل بێشکچی- تێزی تورك بۆ مێژوو- وەرگێڕانی: ئاسۆس هەردی، سلێمانی- دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم- 2000.

4-عەتا قەرەداخی- ستراتیژ کەسێتی نەتەوەیی کورد- سلێمانی- 1998.

5-ئیتنۆنەتەوایەتی کورد- وەرگێڕانی: عەتا قەرەداخی.

6-گفتوگۆی سەربەخۆبوون لەگەڵ بێشکچی- گۆڕینی بۆ زاری سۆرانی: مهاباد کوردی.













**ڕۆڤاری داهاتوو**

**تایبەتە بە شەهیدی قەڵەم عەبدولخالق مەعروف**